رامین جەهانبەگلو

# هزری ناتوندوتیژی

وەرگێڕانی

**مراد حەکیم**

پێداچوونەوەی: موسلح ئیروانی

**چاپی یەکەم – هەولێر**

2002





**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
**کوردستان ت. «٢٢٦٠٣١١»**
**e.mail:mukriani@yahoo.com**
www.**mukriyani.org**

- **کتێبی ژمارە: «٦٦»**
- **کتێب: هزری ناتوندوتیژی**
- **نووسەر: رامین جەهانبەگلو**
- **وەرگێڕانی: مراد حەکیم**
- **پێداچوونەوەی: موسلح ئیروانی**
- **دەرهێنانی هونەری: گۆران جەمال رواندزی**
- **بەرگ : قاسم قادر**
- **چاپی یەکەم: هەولێر – ٢٠٠٢**
- **ژمارەی سپاردن «٨٦»ی ساڵی ٢٠٠٢ دراوەتێ.**
- **چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/ هەولێر**





## پێشکەشە:

## بەدایکم کە تامەزرۆی سووتاندنی کتێبخانەکەمە






## پێرستی بابەتەکان

## پێشەکیی وەرگێڕ

«تەنیا کاتێک دەتوانین لە توندوتیژی دوور کەوینەوە کە لە گۆڕەپانی کۆمەڵایەتیشدا تێڕوانینێکی ئەقڵانیمان هەبێت، چونکە هەر تێڕوانینێکی دیکە بەئاسانی دەمانباتەوە سەر ڕێگای بەکارهێنانی توندوتیژی تەنانەت ئەو هەوڵدانەشمان کە بیەوێت ئەوانیتر بەنەرمی، بەڵام یەکلایەنانە بڕوا پێ بهێنین، و ئەوانیش بە هاوکاری ئەو بەڵگەو نیشانانەی کە خۆمان پێیانەوە دەنازین، لە ڕاستیشیان دڵنیاین، بیانکەینە خاوەن ڕۆشنبینییەک.»

**کارل ڕیمۆند پۆپەر**

-١-

بەم زوانە مرۆڤایەتی ماڵئاوایی لە سەدەیەک کرد، کە سەراپا خوێن بوو. کوشتن و وێرانی فراوانترین پانتاییان تیادا داگیر کردبوو، سەدەیەک کە تیایدا مێژووی مرۆڤایەتی نەهامەتی وەهای بە خۆوە نەبینیوە-بەڵام ناتوانین بڵێین نابینرێتەوە.

دەیان شۆڕش، سەدان کودەتا، چەندان بزاڤی ڕزگاریخواز، دوو جەنگی جیهانی و بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی و هەموو جۆرە چەکێکی تر لەسەر ئاستی کۆمەڵگاکاندا، و لە ئاستی تاکەکەسیشدا کوشتن و ئەشکەنجەدان پێشکەوتووترین تەکنیکیان تیادا خرایەگەڕ. لە هیچ سەدەیەک وەکو سەدەی بیستەم باس لە مافی مرۆڤ و دیموکراسی و لێبوردەیی و .. تد نەکراوە. هیچ سەدەیەکیش ئەو کاولکاری و پێشێلکاریانەی بە خۆوە نەبینیوە. تەنیا لە جەنگی جیهانی دووەمدا نزیکەی پەنجا ملیۆن کەس



گیانی خۆیان لە دەستدا. پێشبرکێی چەکی قۆناغی شەڕی سارد، چەندین ملیارد دۆلار گۆژمەی خستە سەر هاووڵاتیانی جیهان. ئێستاش بە دەیان موشەکی کێشوەر بڕی ئەتۆمی لە دوورترین خاڵەکانی ئەم گۆی زەویە دانراون، کە ڕەنگە ڕۆژێک بەکاربهێنرێن. کارنامەی سەدەی بیستەم پڕە لە ناوی جەنەڕاڵ، فەرماندە، سەرکردە، تەنانەت ئەو ئەفسەرانەی کە لە کوشتاردا بە پێش فیرعەونەکان، نیرۆنەکان، ڕوبسپێرەکان و تەنانەت ستالینیش کەوتوون.

مرۆڤایەتی ماڵئاوایی لە هەزارەیەک کرد، و هەنگاوی نایە هەزارەیەکی ترەوە. بەڵام چ هەنگاونانێک! نەک هیچ زەمانەتێک، بەڵکو هیچ تروسکە هیوایەکیش نییە کە مرۆڤایەتی لەم سەدەیەدا لە سەدەی ڕابردوو شەکەتترو شەلالی خوێنتر نابێت. مەیلی وێرانکاری و دەسەڵاتخوازی لەو پەڕی دایە، پێشبڕکێی چەک هەر بەردەوامە، خەڵکان زیاتر لە سروشت دوور دەکەونەوە و شارستانیەت و کولتووری «ئامێر» باوەشیان بۆ دەکەنەوە. ژینگە زیاتر پیس دەبێت و نەخۆشییە ترسناکەکان لە زیادبووندان. فەندەمێنتالیزم لە برەوسەندندایە، پێشکەوتنی خێرای تەکنەلۆژی مرۆڤەکان زیاتر نامۆ دەکات و کێشە کولتووری و کۆمەڵایەتییەکان نەک چارە ناکرێن بەڵکو پەلوپۆ دەهاوێن. نیچە گوتەنی پێدەچێت ئەوەی مرۆڤ لەڕێی ئەقڵییەوە بە دەستیهێنا هەر لە ڕێی ئەقڵیش کۆتایی پێ بهێنێت.

لەگەڵ زیادبوونی توندوتیژیی فاشیزم و نازیزم لە ساڵی١٩٣٢دا زانای گەورەی ئەڵمانی ئەنیشتاین لە نامەیەکی پڕ لە نیگەرانیدا بۆ دەروونناسی گەورە فرۆید دەپرسێت: ئایا هیچ ڕێگایەک بۆ ڕزگاریی مرۆڤ لە مەترسیی جەنگ هەیە؟ ئایا دەتوانین زەبروزەنگی مرۆیی بە ڕێڕەوێکدا بەرین کە مرۆڤ بپارێزێت لە ئەنگێزەی تۆڵەستاندنەوە و وێرانکاری؟...

فەیلەسوفی ئینگلیزی «برتراند راسل» لە ئەنجامی پێشبرکێی ئەتۆمی لە جیهان لە ساڵی ١٩٦١دا پرسیارێک ئاراستەی هەموو مرۆڤایەتی

دەکات کە ئایا مرۆڤ هیچ داهاتوویەکی هەیە؟ بەم بۆنەوە کتێبێک دەنووسێت و لەو کتێبەدا هەوڵدەدات وەڵامی بداتەوە.

ئەمڕۆش کە شەش مانگ تێپەڕیون بەسەر تەقینەوەکەی نیویۆرک و واشنتۆن و هاوکێشە سیاسییەکان بە تەواوی گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، دەکرێ زیاتر هەست بە ترس و دڵەراوکێ بکەین. چۆن دەتوانین هەست بە ترس نەکەین کە سیمبۆل و موژدە بەخشانی جیهانی ئەمڕۆ هانتینگتۆن و بن لادن و بۆش و شارۆن بن! تەنیا یەک خولی دەنگوباسەکانی شەو بەسە کە چیتر هیوامان بە داهاتوو نەمێنێت.

-٢-

بە زۆری دژایەتییەکانی نێوان مرۆڤەکان بە پەنابردنە بەر توندوتیژی یەکلایی دەکرێنەوە. بۆیە پێویستە لەوە بدوێین کە ئایا توندوتیژی لە خۆڕسکی مرۆڤدا جێگەی گرتووە، یاخود شتێکی مێژووکردە و لە ڕێی بەکۆمەڵایەتیبوونەوە لە ناخیدا جێگیر دەبێت؟ توندوتیژی لە چییەوە دێت؟ بۆچی هەندێک کەس لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیاندا لە دژی ئەوانی تر پەنا دەبەنە بەر شەڕانییەت و خراپەکاری؟ ئایا خەڵک بە سروشت توندوتیژن؟

هەندێک لە تیۆریستان تێگەیشتنێکی ڕەشبینانەیان هەیە. ئەوان پێیان وایە توندوتیژی بەشێکە لە سروشتی مرۆڤ و ئارەزوو و مەیلی سروشتی بە ناچاری مرۆڤ بەرەو ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەوانی تر پەڵکێش دەکات. کاتێک مرۆڤ دەبینێت کە ئەوانی دیکە هەست و ئارەزووەکانی وی ژێر پێ دەخەن، پەرچەکردارەکەی خراپەکاری و توندوتیژی دەبێت. هۆی ئەو توندوتیژییە دەوڵەتان نین، بەڵکو دیاردەیەکی سروشتییە. لێرەوە ئەرکی قورسی حکوومەت دەست پێدەکات، کە پێویستە «نەزم و یاسا» بەرقەرار بکات تا پێش بە توندوتیژی بگرێت.



تەنانەت هەندێک لە تیۆلۆژیستەکان(theologists) کە لە بارەی سیاسەتەوە نووسیویانە هەمان ئەو تێگەیشتنەیان هەیە. دیارترینیان «قەشە ئۆگەستین و مارتین لۆتەر»ن. ئەمانە زەبروزەنگ بە ئەنجامی گونەهباریی سروشتی مرۆڤ لە قەڵەم دەدەن، پێشیان وایە کە کۆمەڵگا مرۆییەکان پێویستیان بە حکوومەتێکی بەهێز هەیە تا ئەو خەڵکانە کۆنترۆڵ بکەن کە خولیای داگیرکارانەیان هەیە. هۆبز و فرۆیدیش دەستنیشانکردنێکی هاوشێوەی ئەوانیان بۆ توندوتیژیی مرۆڤ هەیە، بەڵام لە تێگەیشتنێکی سروشتگەرایانە و دوور لە لایەنی ئاینیی دەیخەنەڕوو. بەڕای ئەوان توندوتیژی ئەنجامی سروشتی پێکهاتەی جیهان و دینامیکیەتی دەروونی مرۆییە.

هۆبز لەو بڕوایەدایە کە سروشت مرۆڤەکان لە یەکتر جیادەکاتەوە و توانای هێرشکردن و لە ناوبردنی ئەوانی تریان پێدەبەخشێت. مرۆڤەکان خواستی دەسەڵاتخوازیان هەیە، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەک. یەکەم، مرۆڤ بۆ بەرگریکردن لە خۆی و بەرپەرچدانەوەی باڵادەستیی ئەوانی تر پێویستی بە دەسەڵاتە. دووەم، جیهان ئەو داهاتە زۆرەی نییە کە لە نێوان هەمووواندا دابەش بکرێت و سێیەم، مرۆڤ بە سروشت پلەوپایەخوازە، عاشقی شکۆیە. مرۆڤەکان بە سروشت بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و ئاشتیخواز نین. بە کورتی بە بڕوای ئەو دۆخی سروشتیی مرۆڤ، حاڵەتی شەڕوشۆڕە. واتە شەڕی مرۆڤ لە دژی مرۆڤێکی دیکە. مرۆڤەکان تەنیا بە پەیمانێکی کۆمەڵایەتی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی بەهێز دەتوانن خۆیان لەم ڕەوشە ڕزگار بکەن.

فرۆید پێی وایە مرۆڤ بە سروشت بوونەوەرێکی توندوتیژە. هەر منداڵێک دەتوانێت ببێتە چەوسێنەرێک و بۆ بەدی هێنانی خواستەکانی خۆی ئەوانی دیکە لە ناوببات، یان بیانکات بە ملکەچی خۆی. کاتێک منداڵ باوک بەرکابەری خۆی دەزانێت لە سەرنج ڕاکێشانی دایکدا،

ئارەزووی مردنی دەکات. مرۆڤەکان لە نەستیاندا چێژ لە باڵادەستیی بەسەر ئەوانی دیکەوە وەردەگرن. فرۆید لە کتێبی «شارستانیەت و نەخۆشیەکانی»دا دەڵێت: مرۆڤ گورگی مرۆڤە. هەروەها لە نامەیەکدا بۆ ئەنیشتاین زۆر بە داخ و پەژارەوە هەستی خۆی لە بەرانبەر شەڕەکانی ئەو کات دەردەبڕێت و دەڵێت: بە لەبەر چاوگرتنی پێشکەوتنی زۆری چەکە مودێرنەکان، شەڕ لە حاڵی حازردا بە مانای لە ناوچوونی تەواوی یەکێک لە دوو لایەنەکە و هەندێ جار هەر دوو لایەنەکەیە.

بەڵام لەو سەرەوە تیۆریستگەلێگ هەن کە نکۆڵی لەوە دەکەن زەبروزەنگ شتێک بێت لە سروشت و دەرونی مرۆڤدا، بەڵکو بە پەیمانگەلێکی «دروستکراوی» کۆمەڵگا مرۆییەکانی لە قەڵەم دەدەن. ئەرستۆ پێی وایە مرۆڤ بە سروشت بۆ تەکامول و ڕێکەوتن چالاکی دەنوێنێت. وەنەبێ ئەرستۆ بایەخ بەو خاڵە نەدات کە هەست و سۆزە مرۆییەکان دەبنە هۆی سەرهەڵدانی گرفتگەلێکی سیاسی، بەڵام بەڕای ئەو پەروەردە و فێرکردنی باش و دروستبوونی دامەزراوە بنچینەییەکان دەتوانن کۆمەڵگاگەلێکی تارادەیەک لەبار و گونجاو بهێننە ئاراوە.

ڕۆسۆ کەللەشەقانەتر لە دژی ئەم تێگەیشتنە دەوەستێت و پێی وایە سروشتە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دژایەتییە سیاسیەکان. ڕۆسۆ بانگەشەی ئەوە دەکات کە مرۆڤ لە ناخی خۆیدا توندوتیژ نییە... مرۆڤ لە بەرامبەر شەڕانیەتی ئەوانی دیکە بەرگری لە خۆی دەکات، بەڵام هەوڵی چەوساندنەوەی ئەوانی دیکەش نادات. هەر کە یەکەم مرۆڤ پارچە زەویەکی پاوان کردو دیوارێکی بە دەوروبیدا بیناکرد و گوتی« ئەمە هی منە» بەدبەختییەکان دەستیان پێکرد. مرۆڤایەتی لە چ تاوانگەلێک، جەنگ و جینایەتێک، ترس و بەدبەختییەک ڕزگاری دەبوو ئەگەر ئەو دیوارانەی ڕوخاندایە و گوتبای سروشت هی هەموانە نەک موڵکی یەک کەس بێت.



«ئەریک فرۆم و مارکۆزێ»ش ڕەخنە لە فرۆید دەگرن، بە پێچەوانەی ئەوەی کە فرۆید پێی وایە توندوتیژی دیاردەیەکی خۆڕسکە و ناتوانین دەروونی مرۆڤی لێ خاوێن کەینەوە، فرۆم و مارکۆزێ توندوتیژی بە پەرچەکرداری مرۆڤ لە بەرامبەر ڕەوشی کۆمەڵایەتی دەزانن و لەو بڕوایەدان ئەو ڕەوشە کۆمەڵایەتییە دەکرێ بگۆڕێت.

من لێرەدا هەوڵ نادەم وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە و خۆم بە دوور دەگرم لەوەی کە کام لەم دوو ئاراستەیە ڕاستەو لایەنگری لە کامیان دەکەم، چونکە ئەوە بەجێ دەهێڵم بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێز بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە کە باس لە چەمکی دژی توندوتیژی دەکات بە بڕوایەک بگات.

-٣-

یەکێک لە نیشانەکانی چاونەترسیی مەدەنی، سەرپێچیکردنی مەدەنییە. سەرپێچیکردنی مەدەنی کارنەکردنە بە پاساوی بەرپرسیارێتی مەدەنی بەو یاسایانەی کە دەسەڵات دایڕشتوون. لە کۆمەڵگا دیموکراتییەکاندا سەرپێچیکردنی مەدەنی دەکرێ لە شێوەی یاسا شکێنیدا دەرکەوێت، یاساشکێنییەک چونکە لەسەر بنچینەی بەرپرسیارێتی مەدەنییە، بۆیەش پێی دەڵێن یاساشکێنی مەدەنی. لە ئەڵمانیا بزاڤی دژە ئەتۆمی زۆر بەهێزە. یەکێک لە شێوەکانی کاری ئەوانەی لە ناو ئەم بزاڤەدا کاردەکەن گرتنی ئەو شەقامانەیە کە ئۆتۆمبیلەکانی ئەو کارگانە هاتووچۆیان پێدا دەکەن. لایەنگرانی بزاڤی دژی چەکە ئەتۆمییەکان ئەم تاوانە ئەنجام دەدەن، تاکو ڕێگا لە تاوانێکی گەورەتر بگرن کە گیانی ملیۆنەها کەس دەخاتە مەترسییەوە. لە ئەڵمانیا تا ئێستاش بوونە سەرباز بە ناچاریە. بەڵام تاکەکەس دەتوانێت ئەو پاساوە بهێنێتەوە کە من لەبەر ئایینم، یاخود باوەڕ و ویژدانم ئامادە نیم چەک و کەرەستەی مرۆڤکوژی هەڵگرم و جلی شەڕ بپۆشم (تەنانەت بۆ پاراستنی نیشتمانیش)، بۆیە

ئامادەنیم سەربازی بکەم. حکوومەت بە رەسمی دانی بەم سەرپێچیکردنە مەدەنییەدا ناوەو ئەو دەرفەتەی رەخساندووە کە هەر کەسێک ئامادە نەبێت سەربازی بکات، دەکرێ لەو ماوەیەدا لە یەکێک لە بەشەکانی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکاندا کارێک ئەنجام بدات.

سەرپێچیکردنی مەدەنی واتە بەرەنگاربوونەوەیەکی ئاشتیخوازانەی یاسا یاخود سەرپێچیکردن لە ئەنجامدانی ئەرکێک لە رەوشێکدا کە تاک هەست دەکات، رەنگە پەیڕەویکردن لەو یاسایە و ئەنجامدانی ئەو ئەرکە دەرئەنجامێکی هەبێت کە بە پێچەوانەی ویژدانی ئەخلاقی، پێچەوانەی بەرژەوەندیی مرۆیی کەسێک یا گرووپێک، پێچەوانەی بەرژەوەندیی کۆمەڵگا بێت. دەکرێ سەرپێچیکردنی مەدەنی بە جۆرێک لە جۆرەکان بە مافی بەرەنگاربوونەوە لە قەڵەم بدەین، مافی بەرەنگاربوونەوە دەشێ بە شێوەیەکی توندڕەوانە دەرکەوێت و بگۆڕێت بۆ مافی شۆڕش؛ میللەت مافی ئەوەی هەیە شۆڕش لە دژی زۆردار بکات.

سەرپێچیکردنی مەدەنی یەکێکە لەو ستراتیژانەی کە پێویستە ئەندامانی کۆمەڵگا بیگرنە بەر بۆ وەلانانی ستەمکاران لە دەسەڵاتدا بەبێ ئەوەی توندوتیژی رووبدات. کەسێکی وەکو دو لا بوئتی بە باشترین ستراتیژی دادەنێت و پێی وایە سەرپێچیکردنی مەدەنی و دژایەتیی دەستەجەمعی بێ توندوتیژی دوو ئەگەری هەیە: یەکەم، هەموو حکوومەتەکان پشت بە رەزامەندی و خواستی کۆمەڵانی خەڵکی گوێڕایەڵ دەبەستن. دووەم ئازادیی سروشتی بەهایەکی بەرزی هەیە، چونکە ئەگەر چەوساندنەوە لەسەر بنچینەی خواست و رەزامەندیی تاکەکان بونیات نرابێت، ئەو کات تاکە رێگای لەناوبردنی چەوساندنەوە، وەرگرتنەوەی متمانە و رازیبوونی ئاپۆرەی خەڵکە لە دەسەڵات. بەم شۆڕشە ئاشتیخوازانەیە ئیعتبار و بەهای چەوساندنەوە بە جارێک دادەڕمێت. بە بۆچوونی ماندێلا مرۆڤ دەروەستە بە سەرپێچیکردنی مەدەنی، پێی وایە



ناکرێ پەیڕەوی لە یاسایەکی نا ئەخلاقی بکەین، بەڵکو پێویستە ئەو یاسایەی کە بە نا ئەخلاقیی دەزانین پێشێل بکەین، ئەو کات ئێمە پەیڕەویمان لە یاسایەکی ئەخلاقی کردووە. ئەم سەرپێچیکردنە مەدەنییە ستراتیژی ماندێلا بوو لە بەرەنگاربوونەوەیدا لەگەڵ یاسای ئاپارتاید کە دواجار توانیان لەناوی ببەن بەبێ ئەوەی پەنا بۆ توندوتیژی بەرن.

-٤-

زۆر بە داخەوە بەهایەکی بەرزی وەک لێبوردەیی تا ئێستاش لە زۆر شوێنی ئەم جیهانەدا نە رێزی لێدەگیرێت و نە ئاوڕی لێدەدرێتەوە، بگرە زۆر جار بە نەنگی و ترسنۆکیش وەسف دەکرێ. لێبوردەیی چەمکێکی ئەقڵی، سیاسی و یاسایی ئازادیخوازە. راستە، ناتوانین هیچ بیروباوەڕێک بەسەر هیچ کەسێکدا بسەپێنین یاخود هیچ کەسێک لە باوەڕەکەی پاشگەز بکەینەوە. هەموو کەسێک ئازادیەکی رەهای هەیە لە هەڵبژاردندا. نە دەوڵەت و نەهیچ دامەزراوەیەکی دیکە، تەنانەت ئایینیەکانیش مافی دەستتێوەردانیان لەم رووەوە نییە. لێبوردەیی بەڕەوا زانینی بوونی بیروباوەڕ و رای جیاواز و فرەلایەنیی سیاسی، ئایینی، کۆمەڵایەتی، فەلسەفی و هونەرییە لەناو سیستمێکی سیاسی-کۆمەڵایەتیدا.

ئێمە بەردەوام شایەدی گۆڕانکارین لە بیروڕا، روانین و دادوەریەکانماندا سەبارەت بە جیهان و ژیان و دەوروبەر. ئەم نموونە سادەیە راستییەکی نکۆڵی لێنەکراومان پێدەڵێت، ئەویش ئەوەیە کە هەموو راستییەکان رێژەیین و ئێمە ناتوانین خاوەنی راستییەکی رەها بین. بۆیە هیچ تاک و گرووپ و دەستەیەک ناتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات کە تەنیا ئەو خاوەنی هەموو راستییەکە و تاک و گرووپەکانی دیکە لێی بێ بەشن. بڕواهێنان و کارکردن بەم راستییە لە ژیانی کۆمەڵایەتیماندا بڕواهێنان و

کارکردنە بە پرەنسیپی لێبوردەیی. رەتکردنەوەی ئەوەیە کە جیهان تەنیا دابەش ناکرێت بەسەر دوو ناوچەی رووناک و تاریک، رەش و سپیدا کە بەرهەمی ئەم جۆرە جیهانبینییە لە پێکدادان و رووبەڕووبوونەوەی چەکدارانە زیاتر شتێکی دیکە نییە، یاخود دەکرێ بڵێین خاڵی بەرامبەر لێبوردەییە کە پێی دەگوترێ نالێبوردەیی، کەجیاوازیەکان رەتدەکاتەوە و لە هەوڵی چونیەک کردنیاندایە. هەروەها نکۆڵیکردنە لە هەموو جۆرە ئۆتۆنۆمی و پلورالیزمێک. دژی دانوستانە چونکە دانوستان داننانە بە جیاوازییەکان. نالێبوردەیی کوشتنی هزرە بە ناوی هزر، نکۆڵیکردنە لە گومان کە دەبێتە هۆی دەوڵەمەندکردنی هزر، و دژی هەموو دۆزینەوە و داهێنانێکی نوێیە، چونکە دۆزینەوە و داهێنان بونیادی ئەوەی ئێمە بە لەکەدارنەبووی دەزانین دەهێنێتە لەرزە. نکۆڵیکردنە لە رەسەنایەتی چونکە رەسەنایەتی بوونی تاکە سیمبۆلێک رەتدەکاتەوە. نکۆڵیکردنە لە هەموو جۆرە فرە لایەنییەک تەنانەت ئەگەر ئارام و شاراوەش بێت....

هەقانیەت و فەزیلەتی لێبوردن لەو خاڵەدایە کە هەردوو لایەنی کێشەکە فەرمانڕەواو گوێڕایەڵ، زۆردار و زۆرلێکراو وەک یەک دەتوانن لە پەنای ئەودا بە ئاسایش و ئارامی بژین. ماندێلا دوای **٢٧** ساڵ زیندانی کە بە سەرۆکی ئەفریقای باشوور هەڵبژێردرا، لە یەکەم وتاریدا بۆ گەلی ئەفریقای باشوور گوتی: «ئەوەی رۆیی رۆیی».

-٥-

ئەم کتێبە لە ئەلتەرناتیڤێک دەدوێت بۆ گۆڕینی مێژووی مرۆڤایەتی، بۆ کۆتایی هێنان بە خوێنڕێژی، بۆ نەهێشتنی کۆیلایەتی و چەوساندنەوە کە ئەویش ناتوندوتیژییە، واتە بڕوانەبوون بە توندوتیژی. رەنگە زەحمەت بێت خەڵک بڕوا بەوە بهێنن کە جگە لە زەبروزەنگ و جەنگ و شۆڕش و کودەتاکان شتێکی دیکە هەبێت لەم جیهانەدا کۆتایی بە زۆداری بهێنێت.



رەنگە هیتلەر و میلۆسۆڤیچ و تاڵیبانمان بە نموونە بۆ بهێننەوە و پێیان وابێت جگە لەو رێگایەی کە لە دژیان بەکارهات نەدەکرا بە شێوەیکی دیکە کۆتایی بە خوێنڕێژی و زۆرداری ئەوان بهێنرێت. رەنگە بگوترێ گوتەی ناتوندوتیژی شتێکی ریزپەڕی مێژووییە و تەنیا پێغەمبەر، عاریف و کەسایەتییە دیارەکانی مێژوو دەگرێتەوە. وایە، ریزپەڕێکی مێژووییە و کەمن ئەوانەی پەنا بۆ ناتوندوتیژی دەبەن، بەڵام ئەم پەنا بردنە بۆ ناتوندوتیژی نیشانەی دلێری و بوێری ئەو کەسانەیە کە ئەوانیتر ناتوانن دەستی بۆ ببەن. ناتوندوتیژی تەنیا پەیوەست نییە بە مێژووەوە، بەڵکو پەیوەندی بە رابردوو و ئێستا و داهاتووی مرۆڤایەتییەوە هەیە. ناتوندوتیژی بەهایەکی بەرزە کە هەموو کەسێک ناتوانێت پێی بگات. ناتوندوتیژی واتە خۆشەویستیی هاوچەشن، واتە رقبوونەوە لە خراپە نەک خراپەکار، واتە وەرچەرخان لە دۆخێکی کۆمەڵایەتییەوە بۆ دۆخێکی دیکە بەبێ پەنابردنە بەر کوشتن و ئازاردان. پێرستی ئەو کەسانەی کە خۆیان لە توندوتیژی بە دوور دەگرن کورت نییە، نموونەگەلێکی وەک گاندی و لۆتەر کینگ و دالایی لاما و دایکە تێریزا وەک ئەستێرە لە ئاسمانی جیهاندا دەدرەوشێنەوە. تا مرۆڤایەتی ماوە ناویان بە چاکە لەسەر زمانان دەگەرێ و مرۆڤایەتی شانازیان پێوە دەکات و خۆی بە قەرزاریان دەزانێت. گاندی دەی زانی پەیڕەویکردن لە «ناتوندوتیژی» پێویستی بەوەیە کە لە بەرامبەر رەنج و زەحمەتدا دان بە خۆیدا بگرێت، بەڵام بە تاکە رێگای سەرکەوتنیشی دەزانی؛ چونکە گەیشتن بە راستی، جگە لە دانبەخۆداگرتنی ئیرادیانەی رەنج و زەحمەت، مومکین نییە. لایەنگری ناتوندوتیژی بەر لەوەی رەنج و زەحمەت بۆ دوژمنی خۆی بخوازێت، پێویستە بە خۆی تەحەمولیان بکات.

ئەو وڵاتانەی ئەمڕۆ بە جیهانی سێیەم ناو دەبرێن، ئەوانن کە سەرچاوەی هزری ناتوندوتیژین. هەڵبەت مەبەستمان ئەوەیە کە

ناتوندوتیژی لەو وڵاتانەدا سەریهەڵداوە، ئەگەر چی ئەمڕۆ دیکتاتۆرترین فەرمانڕەوا و چەوسێنەرترین دەسەڵاتیان هەبێت. دژایەتییەکە لێرەدایە ئەو هەرێمانەی کە بۆ نموونە عیرفانیان تیادا سەرهەڵداوە و شوێنی لە دایک بوونی ئایینەکانی وەک بودایی، زەردەشتی و ئیسلام و مەسیحیەتن، کە تێکرا جەخت لەسەر ناتوندوتیژی و خۆشەویستی و دانبەخۆداگرتن و هاوکاری دەکەن، ئەمڕۆ گۆڕاون بۆ مەڵبەندی توندوتیژی و رق و کینە و ناهاوکاری. چۆن دەکرێ بگەڕێنرێتەوە بۆ دۆخی جاران؟ ئایا هیوایەک هەیە، ئەگەر هەیە، چییە و چۆنە؟ ئەمانە هەمووی پرسیارن کە رەنگە یەکەمین هەوڵ بۆ وەڵامدانەوەیان بۆ ئاساییکردنەوەی دۆخەکە گەڕانەوە بێت بۆ هۆشیاریی لێبوردەیی و بیرۆکەی ناتوندوتیژی و خۆشەویستیی بەرامبەر.

ئێمە جەخت لەسەر هزری ناتوندوتیژی لە جیهانی سێیەمدا دەکەین نەک لە رۆژئاوا، چونکە یەکەم، ئەم هزرە بەرهەمی ئەم هەرێمەیە و لێرەوە چزوی دەرکردووە و گەشەی سەندووە. دووەم لەبەر ئەوەی لەم هەرێمەدا گەورەترین و دڕندانەترین شێوەی زەبروزەنگ بەرچاو دەکەوێت. هەڵبەت ئێمە توندوتیژی تەنیا لە شەڕ و کوشتارەکاندا کورت ناکەینەوە و دەزانین کە زمانی قسەکردن و نووسینیش توندوتیژی هەڵدەگرێت. توندوتیژی لە هەموو رەفتارو بیرکردنەوەیەکی مرۆڤیشدا هەستی پێدەکرێت، بەڵام شەڕو کوشتارەکان کە ئەمڕۆ ئەم هەرێمە بەخۆیەوە دەبینێت توندترین و ترسناکترین و بەردەوامترین جۆری زەبروزەنگن. سوید دوو سەد ساڵێکە شەڕی بەخۆیەوە نەبینیوە، زۆربەی وڵاتەکانی رۆژئاوا نەک تەنیا شەڕێکی دەرەکی یان ناوخۆییان نییە، بەڵکو ئەو ساتانە لە ژیانیاندا کەمن کە تووشی توندوتیژیەکی وەها دێن کە شایانی باس بێت. مەگەر وڵاتێکی وەکو ئەمریکا کە لە بەرەنجامی سیاسەتەکەی و ئەو دژایەتییانەی لە خودی خۆیدا هەڵگرتووە هەندێ شەڕی «عصابات» و تەقینەوەی لە جۆری ئەوەی



ئۆکلاهۆماو بەم دواییەش تەقینەوە سەرسوڕهێنەرەکەی ١١ی ئەیلوول، بەخۆیەوە ببینێت. کەچی جیهانی سێیەم کە بە دەست سەدان کێشەی ئایینی و ئێتنی و نادادپەروەری و چەوساندنەوەوە دەناڵێت، توندوتیژی لە چلە پۆپەی دایە. هەموومان لە رێی تەلەفزیۆنەکانەوە شایەدی شەڕی ئەفغانستان بووین کە چۆن ئەو شەڕەی لە تۆرابۆرا کرا و ئەو بۆمبایانەی بەسەر ئەو ناوچەیەدا بارین تاکو ئێستا مێژووی مرۆڤایەتی شتی وای بەخۆوە نەبینیوە. شایەدی شەڕی هیندۆس و موسڵمانەکانین لە هیندستاندا. هەروەها لە هەموویشی بە ئازارتر و جەرگبڕتر ئەوەیە کە لە فەلەستین روودەدات. بەڵام ئەمە مانای وانییە کە هزری ناتوندوتیژی لەم دەڤەرە بار و بنەی پێچاوەتەوە، نەخێر تەنانەت لەناو جولەکەکانیشدا کە رەنگە زۆربەیان شەڕکردن بە ئەرکێکی ئایینی بزانن دەبینین سەربازگەلێک چەک فڕێ دەدەن و ئامادە نین ببن بە ئامێری مرۆڤ کوژی. هزری ناتوندوتیژی، وەک گاندی دەڵێ بەئەندازەی  چیاکان کۆنە. ئەم هزرە هەر دەمێنێت و بۆ ئەمڕۆی ئەم دەڤەرە پێویستترین و ژیانیترین هزرە. بۆیە پێویستە کاری لەسەر بکرێت و کۆتایی بە توندوتیژی بهێنرێت. توندوتیژی بەرهەمی توندوتیژیە، هیچ کاتێک بە توندوتیژی کۆتایی بە توندوتیژی ناهێنرێت. شەڕی ئێستای هیندۆس و موسڵمانەکان لە شەڕی ئەوانی سەردەمی گاندی توندتر و دژوارتر نییە، و لێرەدا گرنگیی هزری ناتوندوتیژی و کەسایەتییەکی خۆ لە توندوتیژی بەدوورگری وەکو «ماهاتما گاندی»مان بۆ دەردەکەوێت، کاتێ دەبینین هیندستانی ئەو کات بەو توندڕەویە ئایینییەی کە لە لایەن شوێنکەوتووانی هەردوو ئایینەکەوە هەستی پێدەکرا، هیندستان سەرەتای رزگاربوونی بوو لە دەست ئینگلیزەکان و هێشتا لەسەر پێیەکانی نەوەستابوو. بەڵام هیندستانی ئەمڕۆ کە بە یەکێک لە وڵاتە دیموکراتەکانی جیهان دەژمێردرێت و پەنجا ساڵێک بەسەر سەربەخۆیی بوونیدا تێپەڕیوە، بەو هەموو هێزەیەوە کە

خاوەنی چەکی ناووکیشە نەیتوانیوە وەکو گاندییەکی نیوە رووت بەر بە زەبروزەنگ بگرێت.

سەبارەت بە ئێمەی کوردیش، بە درێژایی مێژوومان ئەم وڵاتە خوێنی لەبەر چۆڕاوەتەوە، هەمیشە لەبەر جیاوازی چەوسێنراوەتەوە. لەسەدەی بیستەمدا گەورەترین و دڕندانەترین زەبروزەنگ لە لایەن دراوسێکانەوە بە سەرماندا کراوە. زەبروزەنگ بووەتە بەشێک لە کەسایەتی هەموو تاکێکی کورد. هیچ ماڵە کوردێک نەماوە رۆژێک لە رۆژان نەسوتێنرا بێت، هیچ بەردێکی ئەم کوردستانە نییە خوێنی لە ژێر نەڕژابێت. نەک تەنیا مرۆڤی کورد بەڵکو سروشتی کوردستان بە هەموو شێوەیەک شێوێنراوە، تەنانەت گیانەوەر و زیندەوەرەکانیش تارومار کراون. ئەو توندوتیژییەی بەعس لە کوردستانی باشووردا بە تایبەتی لە دژی هەڵەبجە پیادەی کرد، نموونەی نییە لە هەموو جیهاندا. تا مێژوو ماوە ئەو تاوانانە پەڵەی رەشن بە تەوێڵی ئەنجامدەرانییەوە.

لە راستیدا هەموو توندوتیژییەک مەترسیدارە تەنانەت لە دژی جەلادترین جەلادەکانیش، چ جای لە دژی خەڵکی بێتاوان. بە داخەوە، زۆر دەگمەنن ئەو ساتانەی ئێمە بە ناتوندوتیژی لە دژی زۆردارەکانمان خەباتمان کردبێت، مخابن کە لێبوردەیی و تۆڵەرانس هێشتا لای تاکی کورد نەبوون بە بەهایەکی باڵا. ئێمە لەم دە ساڵەی دوای راپەڕیندا زۆر بە باشی بۆمان دەرکەوت کە چەندە نالێبوردەین و چەندە خۆشەویستیی مرۆڤ لەم وڵاتەدا لە قەیران دایە. ئێمە لە توندوتیژی لە بەرامبەر میللەتی خۆماندا بە هیچ شێوەیەک میهرەبان تر نەبووین لە دوژمنانمان. تەنیا ئەو چەکەمان بەکار نەهێنا کە دەستمان نەکەوت، ئەو ماڵەمان تاڵان نەکرد کە کاوڵ کرابوو و هیچی لێ بەجێ نەمابوو، تەنیا ئەو دیلەمان نەکوشت کە پێش ئەوەی بیکوژین، خۆی کوشت ...

ئەمە ماوەیەکە شەڕ هەرێمی ئێمەی جێهێشتووە، زەبروزەنگ رووی لە





کزی کردووە، پێم وایە هەر لەم ماوەیەشدا ئێمە هەستمان کردووە کە ئێمە مرۆڤین. وەک رامینی جەهانبەگلو لە کتێبێکیدا لە بارەی گاندیەوە دەڵێت، با لەگەڵ گاندی هاوبڕوا بین لەسەرئەوەی کە توندوتیژی، خۆکوژیە، و باوەڕ بکەین کە جیهان لە نەفرەت و بێزاربوون ماندووبووە. کاتی ئەوە هاتووە دان بەوەدا بنێین کە توندوتیژی نە رێگای بیرکردنەوەیە لە ئەوی دیکە، نە رێگای بەڕێوەبردنی سیاسییانەی کۆمەڵگایەکە و نە شێوازێکی گونجاوە بۆ کۆتاییهێنان بە کێشە و گرفتی نێوان میللەتان. پێش ئەمەش رۆمن رۆلان نووسیوویەتی: «ئەگەر ئەم هیوایە لە ناو بچێت، هیچ شتێک نامێنێتەوە، جگە لە شەڕێک و دواجاریش بەربەریەت».

**مراد حەکیم**
**٢٠٠٢/٣/١٦**

**ژێدەرەکان:**


١- توماس اسپریگنز، فهم نظریه‌های سیاسی، ت: فرهنگ رجایی، چاپ دوم، نشراگاه، تهران ١٣٧٠

٢- رامین جهانبگلو، گاندی و ریشه‌های فلسفی عدم خشونت، ت: هادی اسماعیل زاده، نشرنی، تهران ١٣٧٩ .

٣- محمد رضا نیکفر، خشونت، حقوق بشر، جامعه مدنی، طرح نو، تهران، ١٣٧٨ .

٤- ژولی سادا- ژاندرون، تساهل در تاریخ اندیشهء غرب، ت: عباس باقری، نشرنی، تهران ١٣٧٨ .

٥- مسعود سفیری، کالبد شکافی خشونت، نشرنی، تهران ١٣٧٩ .

٦- کیان، ویژەنامە دین، مدارا و خشونت، شماره ٤٥، بهمن- اسفند، تهران ١٣٧٧.

٧- اطلاعات سیاسی- اقتصادی، شماره ١٢٤- ١٢٣ سال دوازدهم،آذر و دی، تهران ١٣٧٧ .

٨- نگاه نو، شماره ١٤، خرداد- تیر، تهران ١٣٧٢ .

«تا ئەوکاتەی کە نەتەوەکان لە پەیوەندییە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکانیاندا، بە مانایەکی تر لە سیستمی سیاسیی خۆیاندا، بە راشکاوی یاسای ئەوین نەناسنەوەو پەسەندی نەکەن، ناتوانن بە مانای راستەقینە پێکەوە یەکبگرن و لە پێناوی چاکەی مرۆڤایەتیدا تێبکۆشن. نەتەوەکان تەنیا بەئەندازەی پەیڕەویکردنیان لەم یاسایە دەتوانن خۆیان بەشارستانی بزانن».

**ماهاتما گاندی**

## پێشەکیی نووسەر

ئەم بەرهەمە ئەنجامی راستییەکە: توندوتیژی بە سەر مێژووی مرۆڤایەتیدا فەرمانڕەوایە. بەدرێژایی سەدەکان مرۆڤایەتی بە دەستی توندوتیژی بێ رێز کراوە و زیانی پێگەیشتووە. لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ هەمیشە توندوتیژیی بەسەردانەکراوە یاخود پیادە نەکردووە ؛ هەروەها هەمیشە لە پەیوەندیی دەسەڵاتگەری یان لە گوێرایەڵیدا نەژیاوە؛ چەند ساتەوەختێکی دەگمەن لە مێژوودا بەرچاو دەکەون کە مرۆڤ هەڵوەستەی لە توندوتیژیی سەبارەت بە هاوچەشنەکانی خۆی یاخود سەبارەت بە بوونەوەرەکانی تر کردووە و بەمەبەستی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵیدا هەوڵی دۆزینەوەی رێگا نەتەوەیی و سیاسییەکانی داوە. مرۆڤ لەگەڵ وتنی «نەخێر» بەرامبەر بە توندوتیژی، روانگەی ناتوندوتیژیی هێناوەتە ئاراوە. ئەم روانگەیە لەجاران زیاتر ناوەندی وتوێژەکانی ئەمڕۆی ئێمەی داگیرکردووە. بەڵام لەپێناوی چاکتر لیتێگەیشتنی پێویستە پەنا ببەینە بەر



مێژووەکەی و نموونە مێژووییە جۆراوجۆرەکانی کە بەدرێژایی سێ سەدەی رابردوو بەرچاو دەکەون.

بۆیە هەوڵمان داوە لە چوار ئاستدا لە روانگەی ناتوندوتیژی بکۆڵینەوە. یەکەم، لە ناو سەرچاوە نەتەوەیی و ئایینییە گەورەکانی مێژووی مرۆڤدا لە رەگوڕیشە کولتوورییەکانی ناتوندوتیژی دەکۆڵینەوە. پاشان لە پەیوەندیی لەگەڵ هزر و چالاکیی ئەوکەسانەی کە لە سەردەمی مۆدێرندا رۆڵیان هەبووە لە داڕشتنەوەیدا، تاووتوێی دەکەین.

دواتر ، سەرنج دەدەینە ئەو خەباتەی کە بەهۆی چوار کەسایەتیی هاوچەرخی ناتوندوتیژی ئەنجام دراوە. لە کۆتایشدا، بەچاوپێداخشاندنێکی خێرا بەو کەسایەتی و بزاڤانەی کە لە بیست ساڵی دواییدا سیمبۆلی ناتوندوتیژی بوونە، لەم هزرە رادەمێنین و هەوڵدەدەین لەمیانەی خەباتی خۆبەدوورگرتن لە توندوتیژیی ئەوان لە پێناوی ئاشتی و مافی مرۆڤدا، بەقووڵی لە چەمکی ناتوندوتیژی بکۆڵینەوە. ئەم توێژینەوەیە بە دیباجەیەک دەست پێدەکات کە هەڵدەستێت بە راڤەکردنی پەیوەندی نێوان ناتوندوتیژی و مێژوو لە میانەی توێژینەوەیەکی وردی دوو لێکدانەوەی «مەعنەوی و ستراتیجی» بۆ ناتوندوتیژی و هەروەها دام و دەزگاکانی لە لایەن کەسایەتییەکی وەک گاندیەوە. لەکۆتاییدا، بەگشتی هەلومەرجەکانی داهاتووی ناتوندوتیژی لەجیهانی سێیەمدا تاووتوێ دەکرێت.

ئەم توێژینەوەیە بەبێ هاوکاری و پشتیوانی ئەو کەسایەتی و دام و دەزگایانەی کە لێرەدا سوپاسیان دەکەم بە ئەنجام نەدەگەیشت. بە ئەرکی خۆم دەزانم زیاتر لەهەموویان سوپاسی لازارۆف، لێپرسراوی بەشی تولەرانسی رێکخراوی یۆنسکۆ بکەم کە بواری ئامادەکردنی ئەم بەرهەمەی بۆ رەخساندم. هەروەها سوپاسی دکتۆر ئیحسان نەرراقی، راوێژکار لەرێکخراوی یونسکۆ دەکەم. یارمەتی و ئامۆژگارییەکانی لەبەرەو پێش

بـردنـی ئـەم  تـوێـژینـەوەیـەدا بۆ مـن زۆر بـەنـرخ بـوون. لـە لایـەکـی تـرەوە پێکهاتەی کۆتایی ئەم کتێبە بەبێ یارمەتی و هاوکاری دڵسۆزانەی رۆناڵد باینەر و داڤید کامیرۆن، مامۆستایانی زانستی سیاسەت و لێپرسراوانی کـتـێـبـخـانەی رۆبـارتز(Robart)ی زانکۆی تۆرێنتـۆ دروست نەدەبوو کـە یارمەتیان دام بۆ بەدەستهێنانی سەرچاوەی پێویست. لەکۆتایشدا هەر لە یەکـەمین رۆژی خـەریکبـوونم بەم بەرهەمـەوە، لەهاندانی راسـتگۆیانە و بنیاتنەرانەی خاتوو خوجەستە کیا (دایکی نووسەر. و) دانەبڕاوم، کە منی بەهرەمـەندکرد لەدیدە رەخنەگر و خەمـخۆرە بەردەوامـەکەی بۆ بەرەوپێش بردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

**رامین جەهانبەگلو**

**تۆرێنتو**

**٥ی کانونی یەکەمی ١٩٩٧**





«ئەگەر ناتوندوتیژی پەیامی چەند کەسێکە، پێویستە وەک ئەرکێک بۆ هەمووان بژمێردرێت، بۆ کەسێک کە ئەوی بینیوە و ئیتر لێی ناڕوانێتەوە، ناتوندوتیژی دەیەوێت سەراپا کردەبێت، دەیەوێت مێژوو دروست بکات».

**پۆڵ ریکۆر**

خاڵی دەستپێکی ئەم توژینەوەیە بڕواهێنانە بە حوکمێکی پێشینە، باوەڕ بەوەی کە ناتوندوتیژی بەهاییێکی پۆزەتیڤی هەیە یاخود بە دەستەواژەیەکی تر نموونەگەلێکی مێژوویی بەنرخی ناتوندوتیژی هەن. سەرەتا دەتوانین بڵێین ناتوندوتیژی دراوێکی مێژووییە کە لێمان دەپێچێتەوە. کەواتە شتێکە پەیوەست بەهەمووانەوە، چونکە لایەنە مێژووییەکەی لە چوارچێوەی سادەی کۆمەڵگای رۆژئاوا تێدەپەڕێت بۆ ئەوەی لە ستراکچەری فەلسەفی، ئاییني و سیاسیی هەموو کولتوورەکانی مرۆڤایەتیدا جێگە بگرێت. کەواتە ناتوندوتیژی هزرێکی نوێ نییە. بەئەندازە مێژووی کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان کۆنە. ئەوەندە بەسە ببینین لەو شوێنانەی کە ستەمەکان، جەنگەکان و دەمارگیرییە ئایینیەکان بەردەوام دەبن، رەتکردنەوەی بەردەوامی شەرعییەتی توندوتیژی چۆن دروست دەبێت و دادەڕێژرێت.

بەم شێوەیە، لە هەر قۆناغێکی مێژووی مرۆڤایەتیدا کە سایکۆلۆجییەتی توندوتیژی لە دەوری تەوەری خولیای دەسەڵاتخوازی و هێزی کاولکاری دەخولێتەوە جۆرە دەرکەوتنێکی هوشیاری سەبارەت بە ناتوندوتیژیی لە مرۆڤدا دەبینرێت کە وەکو هەستی رێزگرتن وایە لە ژیان و





پایەی ئەویتر. بۆیە مێژووی ناتوندوتیژی بریتییە لە رەتکردنەوەی توندوتیژیی مێژوویی. شێوەیەکە بۆ وتنی «نەخێر» بە مێژووێک کە سەراپا نوقمی توندوتیژی بووە. بەڵام رەتکردنەوەی مێژوو وەک توندوتیژییەک، خۆی جۆرە هەنگاونان و بەرەو پێشەوە چوونێکە. کەواتە وەک ڕووبەڕووبوونەوەیەکی سەرەکی، ناتوندوتیژی لەگەڵ پرۆسەی مێژوو لە ناکۆکیدایە، لەبەر ئەوەی مێژووی تایبەت بە خۆی دەخاتەڕوو: مێژوویەک کە زامنی رێزنانە لە پایەی مرۆڤ.

بۆ ئەوەی ناتوندوتیژی دەرک بکەین پێویستە پەنا ببەینە بەر مێژووی ناتوندوتیژی خۆی. مێژووی ناتوندوتیژی چیرۆکی ئەو پیاو و ئافرەتە ریزپەڕانەیە کە چارەنووسی مرۆڤیان خستۆتە سەرشانە ماندووەکانیان. بەم شێوەیە لەژێر ئیشکالی مێژوودا، پیادەکردنی ناتوندوتیژی، رەهەندەکانی داهێنانی تاکەکەسی (لەشێوەی عیرفانی-ئایینی) یاخود رەهەندەکانی بزاڤەکانی بەرگریکردن و سەرپێچیکردنی وەرگرتووە. کەواتە ناتوندوتیژی لەمێژوودا، واتە رەتکردنەوەی توندوتیژی بەدامەزراوکراو و لە هەمان کاتدا وەکو ئەخلاقێکی دۆگمایی باس دەکرێت کە ئامانجەکەی ئیعتیبار بەخشینە بە پایەی مرۆڤ لەرێی خستنەڕووی جیهانبینی ئەخلاقی. کەواتە دەتوانین ناتوندوتیژی بە رەفتارێکی تەواو ئەخلاقی دابنێین، هەروەها بەرێگایەکیش بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ نادادپەروەریدا.

کەواتە ناتوندوتیژی وەک «بەرەنگاربوونەوە»و «سەرپێچیکردن» لایەنێکی نێگەتیڤی هەیە. ستراتیژییەتێکە بۆ رێگەگرتن کە شێوەی جۆراوجۆرەکانی سەرپێچی، وەک مانگرتن، ئابڵوقەدان، خۆپیشاندان و تد... دەگرێتەبەر بۆ کۆتایی هێنان بەو ئێش وئازارەی کە هاتۆتە پێشی. لەمیانەی ئەم شێوازانەدا، ستراتیجییەتی ناتوندوتیژی وەک فشارێکی واقیعی لەسەر رکابەر دەردەکەوێت. بەڵام بۆ ئەوەی ئەم بەرەنگاربوونەوە خۆبەدوورگرانە لە توندوتیژی کاریگەر بێت، پێویستە دزەبکاتە نێو

ستراکچەرە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی. ئەم جۆرە ناتوندوتیژییە، کە دەتوانین بە «ناتوندوتیژیی ستراتیجی» ناوبەین، لەمێژوودا خۆبەخۆ وەکو بەرسڤدانێک دەردەکەوێت، لەلایەن خەڵکێکی ستەمدیتەوە، بۆ بارودۆخێک کە تەحەممول نەکراوە.

لەسەدەی بیستەمدا، دەتوانین حاڵەتگەلێکی جۆراوجۆر لە چالاکییەکانی ناتوندوتیژی لە جۆری «ستراتیجی» ببینین کە تیایاندا ئەو کەسانەی رۆڵی کۆمەڵایەتیی ناتوندوتیژی دەگێڕن هەوڵیانداوە شۆڕشێک لەبەرامبەر توندوتیژیی بەدامەزراوبوودا بەرپا بکەن.

باچەند نموونەیێک بهێنینەوە. بەرەنگاربوونەوەی قوتابییە نەرویجییەکان لەدژی بەڕێوەبەرایەتی نازیی خوێندنی گشتیدا، یاخود رووداوێکی لەوە نوێ تر، خەباتی ئەلبانییەکانی کۆسۆڤۆ (kosovo) لە دژی سیاسەتی بەسربیکردنی نیشتمانەکەیان، خەباتی خۆپەنادان لەتوندوتیژیی نێلسۆن ماندێلا (Nelson Mandela) لە دژی سیاسەتی ئاپارتاید و شەڕی ڤاسلاڤ هاڤێل (Vacelav Havel) دژی سیستمی کۆمۆنیستی، بەنموونەگەلێکی «ناتوندوتیژیی ستراتیجی» لەقەڵەم دەدرێن.

کەواتە لەرێی باوەڕ پێ هێنان و پەنابردنە بەر ناهاوکاری، «ناتوندوتیژیی ستراتیجی» هەوڵدەدات فەزای گشتیی کۆمەڵگای مەدەنی بگۆڕێت. ناتوندوتیژیی ستراتیجی بە جۆرێک لە جۆرەکانی بونیاتنەرو زامنکەری بواری گفتوگۆ و راگۆڕینەوەیە کەتیایدا تاکەکانی کۆمەڵگا دەتوانن دانوستان لەمەڕ کێشەکانیان بکەن.

بەم شێوەیە ئەگەر ئێمەش وەکو هانا ئارێنت (H.Arendt) رازی بین بەوەی کە «سیاسیبوون و ژیان لە دەوڵەتشار (City- State)دا، بەو مانایەیە کە هەموو شتێک لەرێگای گفتوگۆ و باوەڕ پێ هێنانەوە چارەسەر دەکرێت نەک بەزۆر و زەبروزەنگ»[1]، ئەوا دەتوانین «ناتوندوتیژیی ستراتیجی» بەهەوڵێک بزانین بۆ هێناکایەوە و بەڕێوەبردنی دیموکراسی.



بەسەرنجدان لەم خاڵە، «ناتوندوتیژیی ستراتیجی» لەرێی بەرقەرارکردنی پەیوەندییەکانی وتووێژ و دانوستان لەجیاتی پەیوەندییەکانی دەسەڵاتخوازی و ملکەچی لەنێوان جەماوەردا، هەوڵدەدات «مەیلی پێکەوە ژیان» لەکۆمەڵگایەکی دیاریکراودا بهێنێتە ئاراوە. کەواتە «ناتوندوتیژیی ستراتیجی» شێوەیەکی پراکتیکی و ناکۆکی کاری ناتوندوتیژییە.

لە رێچکەی پراگماتیزم و پرۆسەی دروستکردنی ناکۆکی لەفەزای گشتیدایە کە «ناتوندوتیژیی ستراتیجی»بە بەردەوامی «پەیوەندیی بەرامبەرانە»ی نێوان تاکەکان دەهێنێتە کایەوە. بیرۆکەی بنچینەیی ئەم«پەیوەندییە بەرامبەرانە»یە رێزگرتنە لە پایەی ئەویتر. چونکە بەبێ پرەنسیپی رێزگرتن، وتووێژ دروست نابێت، وەک چۆن بەبێ گفتوگۆ و راگۆڕینەوە، سیاسەت بەمانای تەواوی پەیڤەکە نایەتەدی. بەڵام رێزنان لەوی تر بەمانای گۆڕینی بیروباوەڕی وی نییە. جیاوازیی نێوان «ناتوندوتیژیی ستراتیجی »و شێوەی دووەمی ناتوندوتیژی واتە «ناتوندوتیژیی مەعنەوی» لێرەدایە. «ناتوندوتیژیی مەعنەوی» ناتوندوتیژیی عەقیدەیی و تەنانەت ویژدانییە نەک ستراتیجی. کەواتە ئەم ناتوندوتیژییە لەسەر بنچینەی باوەڕی ئەخلاقی یاخود ئایینی، بونیاتنراوە و لەلایەن تیۆرێکی ئایینی یان فەلسەفییەوە وەک فەرمانێکی رەهای ئاراستەکراو بۆ تاک دەخرێتەڕوو: «تۆ بۆت نییە بکوژی» یاخود «هاوچەشنەکەت خۆش دەوێ». کەواتە وەک ستراتیجییەتێکی پەرچەکردارانەی توند بەرامبەر بە بارودۆخێکی سیاسیی دیاریکراو تۆمارکراوە. ئەم جۆرە ناتوندوتیژییە، وەک پرەنسیپێکی ئەخلاقی رۆژانە وایە. کەواتە پشت ئەستوورە بەو تەوەرەی کە پۆل ریکۆر بە «جەوهەرێکی پێغەمبەرانە»ی[2] ناو دەبات . «ناتوندوتیژیی مەعنەوی» لە سەرکەوتنی ویژدانی ئەخلاقی بەسەر یاسای وشکی واقیعیەتدا هەڵقوڵاوە. کەواتە

جەوهەرێکی سیاسیی نییە، چونکە ئامانجی دروستکردنی ناکۆکی نییە لە نێو کایەی گشتیدا: لە راستیدا لە رووی زەروورەتی ئەخلاقییەوەیە ناچێتە ژێر باری دەسەڵاتی سیاسییەوە، چونکە ئەو کەسەی پەیڕەوی لە «ناتوندوتیژیی مەعنەوی» دەکات ئامانجەکەی بەڕێوەبردنی دیموکراتییانەی کۆمەڵگا نییە، بەڵکو مەبەستی پشتیوانیکردنە لە ئەخلاقە ئایینییەکەی لە ڕێگەی ناتوندوتیژییەوە. بەم پێیەش زیاتر هەڵوێست وەرگرتنێکی چاوەڕوانکراوی ئاساییە تا وەکو هەوڵێک بۆ گۆڕینی بواری سیاسی. بۆیە ئەوەی جێگەی گرنگی پێدانە بۆ شوێنکەوتەی «ناتوندوتیژیی مەعنەوی»، داڕشتنی «ئاسۆیی» پەیمانی کۆمەڵایەتی نییە. بەڵکو چەمکی پڕەنسیپێکی زێڕینە بۆ بەرقەرارکردنی ئارامییەکی دەروونی و رزگاریی تاکەکەسی. ئەمە بەو مانایە نییە کە «ناتوندوتیژیی مەعنەوی» ئەو کاتەی یاسایەکی سیاسی بە نادادگەرانە دەزانێت، واز لە سەرپێچی کردن دەهێنێت. تەواو بە پێچەوانەوە، زۆر حاڵەتی مێژوویی باس لەوە دەکەن کە هەر کاتێک ناتوندوتیژی رووبەڕووی دەسەڵاتێکی زۆردارانە دەبێتەوە یاخود دەکەوێتە بارودۆخێکەوە کە توندوتیژیەکی زۆر هەیە، لە پێناو پاراستن و بەرەو پێش بردنی پڕەنسیپەکانی بیروباوەڕەکەی هەوڵدەدات بوارێکی سیاسی بۆ پێکەوە ژیان بهێنێتە ئاراوە. لەو بارودۆخەدا «ناتوندوتیژیی مەعنەوی» ئاراستەیەکی «ستراتیجی» وەردەگرێت بەبێ ئەوەی واز لە جەوهەرە ئەخلاقی- ئایینییەکەی بهێنێت. کەواتە کردەی پشت ئەستوور بە ناتوندوتیژی لەڕێی پشتیوانیکردنی ناسنامە ئایینییەکەیەوە دەردەکەوێت و بەرەنگاربوونەوە نا عەسکەرییەکەی لە حاڵەتی پاکبوونەوەی تاکەکەسیانە تێپەڕ دەکا. بەم شێوەیە، رووبەڕووبوونەوەی پشت ئەستوور بە ناتوندوتیژی و باوەڕی ئایینی دەکەونە ئاراستەیەکەوە. بەرەنگاربوونەوەی ناتوندوتیژانەی ئەو کەسەی کە بڕوای بە ناتوندوتیژیی هەیە تەنیا پەیڕەوی لە نموونەی ئایینی و ئەخلاقی



دەکات. لیستی ناوی ئەو کەسانەی دەروەست بوونە بە بەرەنگاربوونەوە لەم رەهەندە ئایینی و ئەخلاقییەدا درێژە. بێگومان ماهاتما گاندی و مارتین لۆتەر کینگ دوو کەسن لە گەورەترین کەسایەتییەکانی ناتوندوتیژی لە سەدەی بیستدا. دەزانین کە لە لای گاندی راستی و ناتوندوتیژی «دوو رووی دراوێکن.»[٣] لە لای گاندی زەروورەتی راستگۆیی لەگەڵ زەروورەتی ناتوندوتیژی تێکەڵ بە یەکتر دەبن. کەواتە بە بڕوای گاندی، ناتوندوتیژی ڕێگایەکە بۆ ناسینی راستی کە هەمان خوایە. گاندی دەنووسێت: «لە جیهانی واقیعدا، هیچ شتێک بوونی نییە، هیچ شتێک بوونی نییە مەگەر راستی.» بەردەوام دەبێت و دەڵێ: «راستی ماوە، تەنانەت ئەگەر خەڵکیش باوەڕیان پێی نەبێت. راستی خۆی مایەی مانەوەی خۆیەتی.»[٤] کەواتە هەر راستییە کە ڕێگای هزرو کاری گاندی دیار دەکات. ناتوندوتیژی بەبێ بوونی راستی بێ مانایە. کەواتە پێویستە لە لای گاندی چوونە نێو سیاسەت وەک کردەیەکی ئایینی لەقەڵەم بدەین، واتە وەک کردەیەکی عەقیدەیی. سەرەڕای ئەوە گاندیش خۆی ئەم خاڵە دووبارە دەکاتەوە و پشتگیری لێدەکات کە: «من هەمیشە گوتوومە سیاسەتی من پەیڕەوی لە ئایینیەکەم دەکات» یاخود: «من ناچمە نێو سیاسەتەوە ئەگەر تا ئەو رادەیە نەبێت کە گەشە بە توانا ئایینییەکەم بدات.»[٥]

بەم شێوەیە لە لای گاندی سەرپێچیکردنی مەدەنی و ناهاوکاری پێش ئەوەی کاری سیاسی بن کاری ئایینین. لە سیاسەتیشدا وەکو بوارەکانی تر، گاندی لە ژێر کاریگەری بیروباوەڕە ئایینییەکانیدا هەنگاو دەنێت. لە لای ئەو خۆشەویستی (agape) ستوونێکی بەرەنگاربوونەوەی خۆپەنادانە لە توندوتیژی. کەواتە ئەوەی کە کینگ بە خۆشەویستی ناو دەبات، لە راستیدا هەمان ئەو ئایینەیە کە ڕێنماییەکانی مەسیح لە ئامۆژگاریی سەر چیادا دەری دەبڕێت. لەم رووەوە، لە هزری کینگیشدا هەروەکو لە هزری

گاندیدا وایە پەیوەندی لەگەڵ خوا هۆکارێکی کاریگەرو دیاریکەرە. بۆیە، ئەگەر لایەنە ئیلاهییەکەی لە هەڵبژاردنی ناتوندوتیژیدا لاببەین، و ڕەچاوی نەکەین ئەو مەترسییە هەیە کە تەنیا ڕووبەڕووی چارەسازییەکی سادەی خەباتی سیاسی ببینەوە. بەڵام پێویستە لە یادمان نەچێت کە لە هزری کینگدا باوەڕی ئایینی لە ستراتیجییەتی چالاکی کۆمەڵایەتی باشترە. جگە لەمەش، ئەو لە وتار و نووسینەکانیدا بە بەردەوامی جەخت دەکاتە سەر نزیکیی هزری و ڕۆحیی خۆی لە ئایینی مەسیحەوە. بەم شێوەیە، ناتوندوتیژی لە لای کینگ تەنیا ڕێگەچارەیەکی سادەی ستراتیجی نییە، بەڵکو زەروورەتێکی خواناسانەیە و تەنانەت بۆ مرۆڤی باوەڕدار ئەرکێکیشە. بە وتەی کینگ خۆی: «من دەچمە پێشەوە، چونکە پێویستە وابکەم، چونکە من مرۆڤێک و منداڵێکی خواوەندم.»[٦]

کەواتە ئەو شتەی کە «خۆبەدوورگری مەعنەوی لە توندوتیژی» بە خۆیەوە خەریک دەکات، ڕەهەندی شکستی ستراتیجییەتی خۆبەدوورگرتن لە توندوتیژی نییە. چونکە دڵی ئەو شایەدی دەدات کە دوا سەرکەوتن لە خواوەیە نەک لەوەوە. بە بۆچوونی کینگ، خەباتی ئەو خەباتی خوایە، بەبێ خوا، ناتوندوتیژییەکەی بێ بناغەیە. کەواتە کینگ بە ناوی ئەو خوایەی کە داوای شەڕکردن لەگەڵ یاسا زۆردارەکانی لێدەکات، لە پێناو ڕاستی، دادگەری، ناتوندوتیژی و بە تایبەتی بۆ گەڕان بە دوای خوا ڕادەپەڕێ. لە ڕاستیدا هەمان بوونی خوایە کە ناچاری دەکات شەڕ لەدژی یاسا زۆردارەکان بکات.

کەواتە لە بارەی ئەم بۆچوونەوە، ئەو باوەڕە هەیە کە خوا بێ لایەن نییە و هەمیشە خوا زۆر لە بیری بێبەشکراوان و ستەمدیتەکاندایە. ئەمە ئەو بۆچوونە بنەڕەتییەیە کە لە لای ئەو مەسیحییانەی کە خۆبەدوورگرن لە توندوتیژیی وەکو دێزمۆند توتو و دایکە تێریزا، بەرچاو دەکەوێت.

بەڵام ئەگەر بمانەوێت بە قووڵی لە ماهییەتی کارە خۆبەدوورگر لە



توندوتیژییەکانی کەسانی وەک گاندی، کینگ، توتو، دایکە تێریزا و دالایی لاما تێبگەین، پێویستە لە ڕەگوڕیشەی وشەی «ناتوندوتیژی» بکۆڵینەوە. وشەی «ناتوندوتیژی» تارادەیەک وەرگێڕانی پەیڤی سانسکریتی ئاهیمسا =«ahimsa»یە. بە پەنا بردنە بەر چەمکی «ahimsa» مەرجی سەرەکی ساتیاگراها (Satyagraha) (=بنەما تیۆرییەکانی بزاڤی گاندی کە پشت بەسیاسەتی ناتوندوتیژیی دەبەستێ)، گاندی هەوڵدەدات قەرزەکەی بە کەلەپووری کولتووری هیند و بە تایبەتی جەینیزم و قوتابخانەی براهمانی بداتەوە.

وشەی «ahimsa» هەڵگری مانایەکی نێگەتیڤە. پێشگری نەرێی «a» لە وشەی «ahimsa»دا نیشانەی نەفی، دژایەتی و ڕەتکردنەوەیە. واتە ڕەتکردنەوەی «himsa». وەک ئەلبێرت شوایتزەر دەڵێ فەرمانی «hims» شێوەیەکی داتاشراوە لە «han» (کوشتن، بریندارکردن) و دواجار بە مانای حەزکردنە لە کوشتن و بریندارکردن. کەواتە ناوی وەسفکراوی «ahimsa» واتە «خۆبەدوورگرتن لە کوشتن وبریندارکردن.»[٧] بەڵام لەگەڵ ئەوەی ئەم پەیڤە لە لایەنی ڕێزمانییەوە دەربڕی نەرێتییە، چەمکی «ahimsa» ناوەڕۆکێکی پۆزەتیڤ و چالاکی هەیە کە ڕاوەستانە لە بەرامبەر زەبروزەنگ و خراپەدا. ئەمە بەو مانایەیە کە «ahimsa» بە تەواوی هەنگاونانێکی پشت بەستوو نییە بە خۆپەنادان، ڕووبەڕووبوونەوەشە. بەم پێیەش بەپێی بیرۆکەی «ahimsa» ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ خراپە، پێویستە بە نییەتی چاکەوە ئەنجام بدرێ. ئەو کەسەی خۆی بە پڕەنسیپی «ahimsa» دەبەستێتەوە، پێویستە هێزێکی دینامیکی دیکە بکاتە ئەلتەرناتیڤی «himsa»، کە ئەویش پڕەنسیپی خۆشەویستییە.

لەرێی ئیلهام وەرگرتن لە خوێندنەوەی «ئینجیلەکان و قەڵەمڕەوی خوا لە ئێوەدایە»ی بەرهەمی تۆلستۆی، گاندی هەوڵیداوە جوانی بە چەمکی «ahimsa» لە جەینیزم دا ببەخشێت، ئەمەش بە یەکسانکردنی لەگەڵ

فەرمانی خۆشەویستی لە مەسیحیەتدا. لایەنی نێگەتیڤی مانای «ahimsa» لە جەینیزمدا، لە هزری ناتوندوتیژیی گاندیدا بەهایەکی کارای دەبێت. کەواتە لە چوارچێوەی سادەی عیرفانەوە، خۆبەدوورگرتنانە لە توندوتیژی تێدەپەڕێت بۆ ئەوەی چەمکی ahimsa بخاتە نێو چوارچێوەی کردەی زاتییەوە. گاندی دەنووسێت: «من ئەم لێکدانەوەیە لە ahimsa پەسەند دەکەم، کە حاڵەتێکی نێگەتیڤ لە ناتوندوتیژی (بێ ئازاری) نییە، بەڵکو حاڵەتێکی ئیجابییە لە خۆشەویستی و تەنانەت چاکەیە سەبارەت بە کەسێک کە خراپە دەکات. بەڵام ئەوە بەو مانایە نییە کە دەبێت یارمەتی خراپەکار بدەین بۆ ئەوەی خراپە بکات یاخود بەرازیبوونێکی پراکتیکی تەحەمولی بکەین. بە پێچەوانەوە، خۆشەویستی، حاڵەتی ئەکتیڤی «ahimsa»، داواتان لێدەکات کە بە دوورکەوتنەوە لە کەسی خراپەکار لە دژی بوەستی، تەنانەت ئەگەر لە رووی جەستەییشەوە ئازار و ئەشکەنجەی دیبێت.»[٨]

کەواتە گاندی بە سەرنجدانی لە پێویستیی جیهانی مودێرن، راڤەیەکی نوێ بە تیۆری کلاسیکیی ahimsa دەبەخشێت. بەم شێوەیە گاندی، هەروەکو لە جەینیزم، بوودابیزم و هیندۆسیەتدا هاتووە، جەوهەری پێغەمبەرانەی ahimsa لەرێی بەرقەرارکردنی لە ئەزموونێکی مێژوویی ریزپەڕ (استثنائی)دا فراوان دەکات. بەم شێوەیە بە بۆچوونی گاندی ahim-sa دەگۆڕێت بۆ هێزێکی ئەکتیڤ کە بوونێکی تری هەیە و وەکو بزاڤێکی گرووپی کاریگەرییەکی مێژوویی تەواوی هەیە. کەواتە رەسەنایەتی ناتوندوتیژیی گاندی لەوەدایە کە هەم ئەخلاقییە و هەمیش سیاسی، ئەگەرچی سیاسەت لە ژێر دەسەڵاتی ئایین دایە.

هەروەها گاندی، لەرێی دەستنیشانکردنی هەلومەرجە پراکتیکییەکانی ستراکچەری ناتوندوتیژی، کە لە ماهییەتی «مەعنەوی»ی ناتوندوتیژی ئاگادارە، ئەم هزرە بەرەو ستراتیجییەتێکی سیاسی ئاراستە دەکات. بەم



شێوەیە بە بۆچوونی گاندی، هەر جۆرە نزیکبوونەوەیەک لە ناتوندوتیژی وەک هەنگاوێک بەرەو بە ئەخلاقیکردنی سیاسەت لە قەڵەم دەدرێت.

بە بڕوای ئەو، پیادەکردنی ناتوندوتیژی واتە بەخشینی مانایەکی ئەخلاقی بە ژیانی هاوبەشی مرۆڤەکان. بەڵام زەرووڕەتی ئەخلاقیێکی هاوبەش لە کارێکی خۆبەدوورگر لە توندوتیژیی تەنیا دەتوانێت زەرووڕەتێکی ئەخلاقی هاوبەش بێت لە واقعیەتێکی سیاسیدا. ئەوەی کە گاندی ناچار دەکات پەیوەندی هۆ- ئامانج لە گۆشەنیگایەکی ستراتیجیدا لەبەر چاو بگرێت، کاریگەربوونی بزاڤی گرووپییە. چونکە بە بڕوای گاندی، ئەو شتەی کە ahimsa پشتی پێدەبەستێت وەکو عیرفانی جەینیزم یاخود بوودابیزم، تەنیا تاکەکەس لە بەرامبەر ویژدانەکەیدا نییە، بەڵکو پەیوەندی خودیشە کە لە ژێر رۆشنایی مەبەستداری کاری خۆبەدوورگرتن لە توندوتیژیی چەسپیووە. ئەوەی سەرنجی گاندی بۆ خۆی رادەکێشێت فرەیی ویژدانەکانە، نەک شێوەی تاک و تەنیای وێژدان لە مێژوودا. گاندی لەرێی بزاڤێکی مێژوویی بێ وێنەوە، ناتوندوتیژی لە گۆشەگیرییە عارفانییەکەیدا دەردەهێنێت تاکو دینامیکیەتی گۆڕانی کۆمەڵایەتیی پێ ببەخشێت.

بەم شێوەیە ناتوندوتیژی لە روانگەی گاندییەوە دەگۆڕێت بۆ شێوەیەک لە بوون و شێوازێکی خەبات. گاندی زەرووڕەتی ئەخلاقیی ناتوندوتیژی (بەو شێوەیەی لە لای ئایینەکان و فەلسەفەکان ناسراوە) وەردەگرێت و دەیخاتە شوێن ستراتیجی سیاسییەوە. کەسانی خۆبەدوورگر لە توندوتیژیی وەکو مارتین لۆتەر کینگ، ڤینۆبا بهاڤا (Vinoba Bhava)، عەبدولغەفارخان، لانزا دێل ڤاستۆ (Lanza del Vasto)، دالایی لاما و دێزموند توتو بە تەواوی شایستەی ئەوە بوون کە ئەم کارە بکەن. ئەوانیش وەکو گاندی لەو باوەڕەدا بوون کە خەباتی خۆبەدوورگرتن لە توندوتیژی لە پێناو دادگەری و دیموکراسیدا زەرووڕەتێکی ئەخلاقییە کە لە باوەڕی

ئاییینیەوە فێری دەبین؛ جگە لەمەش لە توانای دایە ئەم شتە گشتییە بکات بە ستراتیجییەتێکی کۆمەڵایەتی.

ناتوندوتیژیی کە بەزۆری بە بوێری، خۆشویستنی ئازادی، دانبەخۆداگرتن دەناسرێتەوە دژی سروشتی وەستاو وجێگرە. ناتوندوتیژی دروستکەر وکارامەیە و لە توانای دایە دینامیکیەتی کۆمەڵگا بباتە پێشەوە و گەشە بە دادگەری و دیموکراسی بدات. بە کورتی کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆ پێویستیەکی زۆریان بە دینامیکیەتی ناتوندوتیژی هەیە تاوەکو بە شێوەی رابردوو خۆی لە باڵادەستیی هەموو جۆرە توندوتیژیەک (سیاسی، ئابووری، کولتووری و رەگەزی) کە پیاوان و ئافرەتان لە مافی قسەکردن و تەنانەت لە مافی ژیان بێبەش دەکات، رزگار بکات. سەرکەوتنی ناتوندوتیژی، سەرکەوتنی خەباتی دیموکراتی یاخود گفتوگۆی نێوان هاووڵاتیانیشە بۆ بڕیاردان لە بارەی داهاتووی هاوبەشیان، چونکە وەک چۆن ئەریک ویل (Eric Weil)ی فەیلەسووف دەڵێت: «ناتوندوتیژی، لە مێژوودا و لە لایەن مێژووەوە، بووەتە ئامانجی مێژوو و وەک ئامانجی مێژووش لێکدەدرێتەوە.»[٩]



## پەراوێزەکان


1- voir H. Arendt: *On Violence in Crises of the Republic*, Harcourt Brace JovanoVich, New York, 1972.

2- voir Paul Ricoeur: *Histoire et Verit* , editions du Seuil, Paris.

3- voir in Jean Herbert: *Ce que Gandhi a vraiment dit*, Marabout Universit , Paris, 1969, p.83.

4- Ibid, p.80.

5- Ibid, p.128

6- cit in Serge Molla: *Les id es noires de Martin Luther king*, Labour et Fides, Gen ve, 1992, p. 180.

7- Albert Schweitzer: *Indian thought and its development*, Hodder and Stoughton, London, 1939, p. 79.

8- M. K. Gandhi: *Young India January* 19, 1921 cit in Jag Parvesh Chander: Teachings of Mahatma Gandhi, Indian Printing Works, Lahore, 1945, p. 412.

9- Eric Weil: *Philosophie Politique*, Vrin, Paris, 1956, p. 233.






## ١- لائۆتسە و تائۆ

دەرککردنی ژیاری چین بەبێ گەڕانەوە بۆ تائۆتێ کینگ زەحمەت و هەندێک جار نامووکینە. «تائۆ» کۆنترین نووسراوی تائۆئیزمە. تائۆ لە قۆناغێکی مێژوو (لەوانەیە لە نێوان سەدەی شەشەم تا چوارەمی پێش زایین)یدا نووسراوە کە لەو ماوەیەدا وڵاتی چین لەبەر جەنگە خوێناوییەکانی نێوان دەرەبەگەکان لە رەوشێکی پەرێشاندا دەژیا. کەواتە دەتوانین تائۆ بە کاردانەوەیەک لە بەرامبەر سیستەمی فەرمانڕەوا لە سەردەمی خۆیدا لە قەڵەم بدەین. بەم پێیەش پەی بەوە دەبەین کە بۆچی لە تائۆ تێ کینگدا ئەو دەستەواژانە دەبینرێن کە پشت دەبەستن بەوەی کە لائۆتسە پیادەکردنی سیاسەتە هەییەکان (موجود) بە توندی دەخاتە بەر رەخنەوە. بۆ نموونە لە بەندی ٧٥دا دەنووسێت «خەڵکان برسین، لە کاتێکدا فەرمانڕەوا لە رادەبەدەر باجەکان زیاد دەکات. هەر لەبەر ئەوەیە کە خەڵکان برسین.»[١] یاخود لە بەندی ٧٤دا دەڵێ: «خەڵکان لە مردن ناترسن، بۆچی بە مردن دەیانترسێنن؟»[٢] هەموو ئەم مشتومڕانەی کە دراونەتە پاڵ لائۆتسە، ئەوە بۆ راڤەکەرانی دەردەخەن کە راپەڕینێک لە دژی رژێمی فەرمانڕەوا بەرپابووە. ئەم بۆچوونە هێندە ناڕاست نییە، چونکە نابێت ئەوە لەبەر چاو نەگرین کە تائۆئیزم، لە سەرتاسەری مێژووی چیندا فەلسەفەی کەمایەتی ئەو خەڵکانە بووە کە لە کۆمەڵە نهێنییەکاندا لە دەوری یەکتر خڕبونەتەوە تاکو لەگەڵ حکوومەتی ئەو کاتە بجەنگن. لەم رووەوە، تائۆئیزم لەگەڵ پرەنسیپە کونفۆشیوسییەکانی وەک کۆنترۆڵ و ئەرکەوە دەکەوێتە دژایەتی. چونکە لە فەلسەفەی «تائۆ»دا ، زیاتر جەخت





دەکرێتە سەر خۆورووژاندن و هەماهەنگیی سروشت. بە مانایەکی تر «تائۆ» لە جیهاندا ئەنجامدانی هیچ کارێک راناسپێرێت، بەڵکو «یارمەتی هەموو شتێک دەدات تاکو بە دوای سروشتی خۆیدا بچێت.» کەواتە «تائۆ» سوود لە هەموو شتێک وەردەگرێت بەبێ ئەوەی گیانی رکابەری لە خۆیدا پێشان بدات. «تائۆ» تەواوکەرە، بەڵام بەو شتەی کە تەواوی دەکات لەخۆبایی نابێت. بە بۆچوونی لائۆتسە «تائۆ» ، «دایکی» هەموو شتێکە، هەروەها «باپیری» هەموو ئەو شتانەشە کە بوونیان هەیە. بۆیە «تائۆ» بە خۆی نەبینراو، نەبیسراو و هەمیشەیی (لایزال)یە. یەکێتیەکە لەودیو فرەیی ژیانەوە. بەم شێوەیە «تائۆ» وەکو ئاو رەوانە، هەم بە راست و هەم بەلای چەپدا. «هەر شتێکی پەیدا دەبێت وابەستەیە بە ئەو و ئەویش ئەم وابەستەییە رەتناکاتەوە.»[٣]

کەواتە «تائۆ»بێ ناو (wu-ming)ە. بێ ناوە چونکە شتێکی بابەتیی نییە. هەروەها لە ناوچوو (wu)ە، چونکە «هەموو جیهان لە بوون پەیدا دەبێت، [بەڵام] بوون، خۆی لە نەبوونەوە[٤] پەیدا بووە.» چەمکی نەبوون لە هزری تائۆدا بیرۆکەی بنچینەییە. بە بڕوای لائۆتسە بوون و نەبوون تەواوکەری یەکترن. بە بڕوای ئەو، لە راستیدا، بوون هەیە، وەک چۆن فرەیی هەیە. بەڵام بوون و فرەیی هەردووکیان لە نەبوون واتە لە «تائۆ»وە سەرهەڵدەدەن. بەڵام کە بڵێین «تائۆ» هەمان «نەبوون»ە ئەوە ناگەینێت کە تایبەتمەندییێکی نێگەتیڤی هەیە.

بە بڕوای لائۆتسە «لەناوچوون» بەتاڵاییە (خلأ)، واتە ئەو تایبەتمەندییانەی نییە کە لە رێگەی پێنج هەستەکانەوە هەستی پێدەکرێت. هەروەها حاڵەتێکە کە زانای تائۆئیست ئەو کاتەی لە «تائۆ»دا رۆدەچێت دەتوانێت پێی بگات. لائۆتسە بەم شێوەیە وەسفی «نەبوون» دەکات: «هەر تایەیەکی گالیسکە سێ پەڕەی هەیە، بەڵام کارایی تایەکە بە هۆی بوارە بۆشەکەیەوەیە. بۆ دروستکردنی ژوورەکانی خانوویەک، دەرگاو پەنجەرە

دروست دەکەن، بەڵام کارایی خانووەکە لەبەر بوارە بۆشەکەیەوەیە. بەم شێوەیە بوون بە سوودە، نەبوون کاراییە»[٥]. کەواتە تائوئیستی زانا ناتوانێت بە خۆشبەختی بگات، مەگەر واز لە خواستە خۆویستەکانی بهێنێت. بە مانایەکی تر، پێویستە خۆی بپارێزێت لە زێدەڕۆیی، ئیسراف و زیادەڕەوی. جگە لەوەش، هەموو جۆرە گیانێکی رکابەرانە و هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە هەستەکانەوە پشتگوێ دەخات. چونکە بە وتەی لائوتسە: «پێنج رەنگ مرۆڤ کوێر دەکەن و پێنج دەنگیش کەڕی دەکەن...»[٦] کەواتە بۆ مرۆڤی دانا توانای داهێنان فەزیلەتێکی سەرەکییە، بەبێ ئەوەی بە داهێنانەکەی بنازێت یاخود بیەوێت ببێتە خاوەنی.

تائوتێ کینگ داوا لە مرۆڤەکان دەکات رێی ژیانی سادە، ئارام و بێ خەوش بگرنەبەر، واتە ئەو رێیەی کە هیچ نیشانەیەکی دەسەڵات، نێوبانگ و دەوڵەمەندیی تێدا نەبێت. بەم شێوەیە پێویستە زانا بە دوای «سێ گەنجینە»وە بێت کە بە بڕوای لائوتسە چاکە، دان بەخۆداگرتن و پایەنەخوازین. چونکە تەنیا بەم رێگایە زانا دەتوانێت ببێتە ئازا، لێبوردە و سەرکەوتوو. لێبوردەیی و چاکە رەگەزی سەرەکیی فەزیلەی تائوئیستن پێویستە خۆشەویستیش بۆ ئەم فەزیلەتانە زیاد بکەین، چونکە بۆ ئەوەی بە «تائو» بگەین پێویستە بتوانین سروشت و هەموو مرۆڤەکانمان خۆش بوێین. کەواتە تائو تێ کینگ رێگای ناتوندوتیژی هەڵدەبژێرێت، چونکە بە بڕوای لائوتسە «چاکەکردن»[٧] تاکە رێگایە بۆ تۆڵەسەندنەوە. لەبەر ئەم هۆیەشە کە بەم شێوەیە جەنگ مەحکوم دەکات:«سوپای باش ئامرازی مەینەتییە، جێگەی نەفرەتی هەمووانە. بۆیە ئەوەی لەگەڵ تائویە حەزی لە شەڕ نییە.»[٨] بەم پێیەش بەو ئەنجامە دەگەین کە تائو تێ کینگ شوێنێکی بەرزی لە ئەدەبیاتی ناتوندوتیژیدا هەیە، لەم روانگەیەوە دامەزرێنەرە شێمانەییەکەی، لائوتسە، وەک مەسیح و بوودا لە پێشڕەوانی



رێبازی ناتوندوتیژییە.

**تائو تێ کینگ**

زانا هزری نەگۆڕی نییە
ئەو هزرەکانی خەڵک دەکات بە هی خۆی
من لەگەڵ ئەوانەی کە چاکن بە چاکی رەفتار دەکەم
من لەگەڵ ئەوانەی کە چاک نین بە چاکی رەفتار دەکەم
بەم شێوەیە من چاکی بە دەست دەهێنم
من لەگەڵ ئەوانەی کە راستن، راستم
لەگەڵ ئەوانەی کە راست نین، راستم
بەم شێوەیە من راستی بە دەست دەهێنم
بەندی ٤٩

**٢- رێنماییەکانی بوودا**

سیدارتا گوتاما (Siddharta Gautama)ی ناسراو بە «بوودا» واتە بێدار و رووناکی تەواو، لە دەوروبەری ساڵی ٥٥٠ی پ. ز لە هیندستان لە دایک بوو. گوتاما لە هۆزی ساکیا(Cakya) بوو و لە لومبینی (Lumbini) دەژیا، ئەو شارەی کە ئەمڕۆ بەچەند کیلۆمەترێک دەکەوێتە سنووری هیندستان و نیپالەوە. سودۆدانا (Suddhodana)ی باوکی سەرۆکی هۆزی ساکیا بوو کە بارەگاکەیان شاری کاپیلاڤاستو(Kapilavastu) بوو. باوکی بودا هەموو شتێکی پێویستی ئەنجامدا تا کوڕەکەی بتوانێت لە بواری فەلسەفە، ئەخلاق و خوێندنی ڤیداکان و لە خوێندنێکی یاریدەدەر بەهرەمەند بێت. هەروەها بەو ئومێدەی رۆژێک ببێتە پاشا، گوتامای فێرە هونەری شەڕ کرد. گوتاما ١٨ساڵان بوو کە شازادەی شۆخ و شەنگ گۆپا یاشۆدارا(Gopa Yashodara)ی مارەکرد. بۆ ماوەی دە ساڵان لەگەڵ

خێزانەکەی لەخوشگوزەرانی و نازو نیعمەتدا ژیا.
تا شەوێکیان خوایەکانی لەخەودا بینین کە داوایان لێدەکرد واز لە ژیانی شازادەیی بهێنێت و ئاوارەیی بگرێتە بەر. بەڵام تا ئەو ڕۆژە گوتاما نەچووبووە ئەو دیوی دیوارەکانی کۆچک و سەراکەی. ئینجا بڕیاریدا لەگەڵ گالیسکەچییەکەی بەنێو گەڕەکەکانی شارو دەوروبەریدا بگەڕێت و جیهان ببینێت.

سەرەتا ڕووبەڕووی پیرەمێردێک بوونەوە کە لەبەر پیری لاشەکەی زۆر بێهێز ببوو و ڕووخسارێکی پڕ چرچ و لۆچی هەبوو. ئەو کاتە شازادە لە گالیسکەچیی پرسی:« ئەوە کێیە بەسەروڕیشی سپییەوە، بەچاوانی ریفۆق کردوو و لاشەیەکی بچووک و بێچارەوە؟ بەزەحمەت و بەهۆی گۆچان دەتوانێت لەسەر پێیەکانی ڕاوەستێت». گالیسکەچی وەڵامی دایەوە:«ئەمانە نیشانەی پیرین». ئەوکات گوتاما تێگەیشت کە پیری کۆتایی مرۆڤی «بمرە». لەپاش ئەوەی پیرەمێردیان بەجێهێشت، کەسێکی نەخۆش لەبەرامبەریان دەرکەوت، لاشەکەی لە پەلوپۆ کەوتبوو و لەبەر ئازار دەیناڵاند. ئەوکات شازادە لە گالیسکەچییەکەی پرسی:«ئەمە چ جۆرە مرۆڤێکە؟» گالیسکەچی وەڵامی دایەوە:«ئەمە مرۆڤی نەخۆشە». خەم زیاتر گوتامای داگرت. گالیسکەچی پەلەی کرد تاکو لەم نمایشە غەمگینە هەڵێت، لە پڕێکا چوار پیاو بە پێشیاندا تێپەڕین کە لاشەی مردووێکیان لەسەر شان بوو، گوتاما پرسی:« ئەم پیاوانە چی لەگەڵ خۆیان دەبەن؟» گالیسکەچی وەڵامی دایەوە:« ئەمە پیاوێکە جەستەی وشک بووە، ژیان تیایدا باری کردووەو هزروبیری خامۆش بووە. خێزانەکەی و ئەوانەی خۆشیان دەوێت دەیبەن بۆ گۆڕستان». ئەو کات خەمێکی گران شازادەی داگرت و پڕبوو لەهەستی هاودەردی بۆ هاوچەشنەکانی. لەپاش گەڕانەوەی بۆ سەرا، ئیتر ڕووخساری ئارامی بەخۆوە نەبینی و دەمەو شەوان هەڵسا چووە باخچەوە. لەوێ تارماییەکی بینی. گوتاما پرسی:«تۆ کێی و لەکوێوە



هاتووی؟» تارمایی گوتی:«من زاهیدم، لە ماڵەوە هەڵاتووم تا ڕێگای ڕزگاری بدۆزمەوە. ئەمە هەمان ئەو ڕێگایەیە کە پێویستە تۆ بیبڕی. تێبکۆشە بۆ داواکارییەکەت تا پێی بگەی. بەدوای ڕێگاکەتدا بڕۆ و لێی لامەدە تا پاداشتەکەت وەربگری... تۆ دەبی بە بوودا، مامۆستاو پێشەوای ئێمە؛ تۆ ڕووناکی بە جیهان دەبەخشی و مرۆڤایەتی لە لەناوچوون ڕزگار دەکەی».

بەم شێوەیە سیدارتا زولفە شەپۆڵدارەکەی تراشی، جلی شایانی داکەند و جلێکی هەژارانەی پۆشی. ساڵانێک لە کوچە و کۆڵانەکاندا ئاوارە بوو و خانوو بە خانوو داوای خێری دەکرد. ماوەی شەش ساڵ لە دەوروبەری ئوروڤیلا (Uruvela) ژیا.

چوارمەشقی و بێ جوولە لە گۆشەیەک دادەنیشت. سەرەنجام تێگەیشت کە ریازەت ڕێگایەکی ڕزگاری نییە. ئەو کات ئەو قاپە برنج و شیرەی کە کچێک پێیدابوو هەڵگرت و خۆی بەرووبارەکەدا بەردایەوە تا ڕێگای بۆد گایا (Bodh Gaya) بگرێتە بەر. لەوێ بوو کە مارێ، خوای خۆشەویستی و فەرمانڕەوایی لەزەتە هەستپێکراوەکان لە دژی ئەو ڕاپەڕی؛ تۆفان، بروسکە و بارانە سێلاوییەکانی ناردنە خوارەوە. بەڵام بوودا هەمووی گۆڕین بۆ گوڵە ئاسمانییەکان . بەم شێوەیە بوودا زاڵبوو بەسەر تینوویەتی، هەوەس، لەزەت و شەهوەتدا. ئەو کات هزری خۆی لەسەر ڕەنجی گشتی چەق پێبەست. «ئەو لەمیانەی کاتی بێ سەرەتا و بێ کۆتایی ڕەوڕەوەی بێ کۆتای ئافریدەکان، (هەر) لەجیهانی دۆزەخ و جیهانی گیانەوەرانەوە تا خودی خواکان هەمووی بینین کە تا بێ کۆتایی بەردەوامبوون. بەسەر زنجیرەی هۆیەکاندا تێپەڕی تا تێگەیشت کە هۆی گشتی، تینوویەتیی بوونە». ڕوشنگەری و گەیشتنی بوودا بە سنووری بوودای باڵا بەم شێوەیە بوو. بوودا ئاوارە بووەوە. لە دێیەکەوە دەچووە دێیەکی تر. خەڵکی فێرە ئایینەکەی دەکردن و پەرجوو(معجزة)ی دەکرد. گەڕایەوە گاپیلا ڤاستا و

لەگەڵ بنەماڵەکەی دیداری نوێکردەوە. بەڵام هێشتا بەجلی ئەوانەی کە وازیان لەجیهان هێناوە دەرۆزەی لە ماڵەکان دەکرد. زۆری پێ نەچوو کە پەرجووە گەورەکەی ئەنجام دا، لەسەر نیلوفەرێکی سپی بەرەو ئاسمان فڕی، لە کاتێکدا کە براهما لەلای ڕاست و ڤایندار لەلای چەپی بوون. چل ساڵ بەم شێوەیە ژیا، ڕێنماییەکانی بڵاودەکردنەوە و چاکەی دەکرد. لەکاتی پیریدا ، گۆڕەکەی لە کەناری ڕووباری هیرانیاڤاتی(Hiranyavati) لە نێوان دوو درەختدا ئامادە کرد. دوایین وتەی بۆ ئاناندا (Ananda)ی قوتابییەکەی ئەمە بوو:

«ئەی ئاناندا ناڵە ناڵ مەکە و بێ هیوا مەبە. پێویستە مرۆڤ دەست لە هەموو ئەو شتانە هەڵگرێ کە خۆشی دەوێن و دڵی پێیانەوەیە. چۆن دەبێت هەر شتێکی پەیدابوو، زەروورەتی لەناو چوونی لە خۆی دایە؟ چۆن دەبێت کە بوونەوەرێکی ئاوها قەتاوقەت ڕووبەڕووی داهێزران نەبێتەوە؟ ئەم ڕەوشە ناتوانێت بگۆڕدرێت... لەراستیدا، ئەی قوتابی، ئەمەت پێ دەڵێم، هەموو ئافریدەیەک لەناودەچێت. بە بەردەوامی هەوڵبدە.»[٩]

ئایینی بوودا لەسەر چوار حەقیقەتی باڵا ڕاوەستاوە: حەقیقەتی ڕەنج، حەقیقەتی سەرچاوەی ڕەنج، حەقیقەتی ڕزگاربوون لە ڕەنج، و حەقیقەتی ڕێگای ڕزگاربوون لە ڕەنج.

بەپێی ئەم ئامۆژگاریە سەرتاپای ژیان دەرد و ڕەنجە. بوونەوەر ڕەنج دەکێشێت چونکە پەیوەستە بە«خود»ەوە. کەواتە حەزکردن لەخود سەرچاوەی ڕەنجە. حەزکردن لە«خود» بەشێوەی وابەستەیی بە جیهانەوە ڕوودەدات کە ئەو هێزە پێک دەهێنێت کە بە«کارما» (Karma)ناودەبرێت. «کارما» ناکەوێتە ژێر کاریگەریی مردنەوە و بەردەوامی بە ژیان دەبەخشێت. لەم ڕووەوەیە کە ڕەوڕەوەی ئافریدەکان هەڵدەسوڕێت و بوونەوەرەکان ناچار دەکات بۆ دۆنادۆن(التناسخ). بەکورتی بەبۆچوونی بوودا بۆ ڕزگار بوون لە ڕەنج و ڕەوڕەوەی ئافریدەکان پێویستە حەز



نەهێڵین. بەم شێوەیە بۆ کردنەوەی دەرگا بە ڕووی «نێرڤانا»دا، ئەو حاڵەتەی کە بە دامرکاندنەوەی سوداکان دیاردەکرێت، بوودا لەناوچوونی گشتی بۆ بیرۆکەی «خود» پێشنیار دەکات. کەواتە پێویستە مرۆڤ لەرێی وەستان لە دژی هەموو شێوەکانی لەزەت و حەزەوە، خۆی لەهەموو جۆرە خۆشەویستی و گوناهێک دووربگرێت.

ڕقیش لە بوودایزمدا جۆرە حەزێکە، بەهەمان شێوە کە تووڕەییش وایە. تووڕەیی زەینی، بە تووڕەیی لەکردەوەدا کۆتایی دێت. کەواتە بۆ بڕینی ڕێگای زانایی، پێویستە مرۆڤ هزرێکی دادپەروەرانەی هەبێت. چونکە بە بڕوای بوودا نادادپەروەری هەمان توندوتیژییە. بەمانایەکی تر لە فەلسەفەی بوودادا، دادپەروەری و ناتوندوتیژی پەیوەندیان بە یەکترەوە هەیە. بەبۆچوونی بوودا، ناتوندوتیژی بەرزترین فەزیلەیە، چونکە بۆدیساتڤا (Bodhisatva) دەریایەکە لە سەبر و دانبەخۆداگرتن. ئەو خۆشەویستی بۆ دوژمنەکانی دەچێنێت و لەگەڵ هەموو بوونەوەران هاودەردە. بە گوتەی بوودا «ڕق گەورەترین تایە.»[١٠] دەتوانین ڕێنماییەکانی بوودا لەدێڕێکدا وەربگرین و لە داماپادا (Dhammapada) دا کورت بکەینەوە: «خراپەنەکردن (papa)، چاکە چاندن(Kusala)، پاککردنەوەی نەفس(Citta)[١١].

کتێبی پیرۆزی بوودایییەکان تی پیتاکا (واتە سێ سەبەتە)یە. بەمانایەکی تر نووسینەکانی بوودایی لە سێ بەشدا هاتوون: بەشی یەکەم، ناوی سوتاپیتاکا (Sutta-Pitaka)(سەبەتەی قسەکان)یە، هەموو ئەو ڕاستییانەی کە بوودا بەوانەی وتوونەتەوە دەگرێتە خۆ. ئەم ڕاستییانە شێوەی ئامۆژگاری و گفتوگۆیان بەخۆوە گرتووە. بەشی دووەم ڤیایا پیتاکا (Viaya-pitaka)(سەبەتەی پرەنسیپەکان)یە کە ڕێبازە ئایینییەکان بۆ ڕاهیبە بوودایییەکان دەگێڕێتەوە. بە بەشی سێیەم یاخود بەشی کۆتایی دەڵێن ئابی داما پیتاکا (Abhidhamma-pitaka)(سەبەتەی ڕێبازی باشتر).

ئەم بەشــە لە دوو بەشــەکــەی تر ئالۆزترە، چونکە ئامــانجی راڤــەکــردن و دەستەبەندیکردنی هەموو ئەو رەگەزانەیە کە مرۆڤێک دروست دەکەن. بەم شێوەیە، بە بۆچوونی بوودایــیــەکــان تی پیــتــاکــا ئەو رێنمــایی و رێگــایانە دەگرێتەوە کە بۆ گەیشتن بە نیرڤانا پێویستە بگرێنە بەر.

**هەندێک لە رێنماییەکانی بودا لەبارەی ناتوندوتیژی**

١- « لەبەر ئەوەی کــوێلەی رق و پارانەوەیە، راســتــی بە شــاراوەیی دەمێنێتەوە.» [١٢]

٢- «لەرێی چاکەکردنی بەردەوام بەرێگای نەمری دەگەین و بەهاوەدەردی و خێرخوازی رۆحمان کامڵ دەکەین.» [١٣]

٣- «کینە لەگەڵ کینە هەڵناکات. کینە لەگەڵ ئەوین هەڵدەکات. ئەمە یاسایەکی هەتاهەتاییە.» [١٤]

٤- بوودا دەڵێت: دە شت هەن کردەوەی بوونەوەران بەرەو خراپە دەبەن، و ئەگەر لەم دە شتە دوورکەونەوە کردەوەیان باش دەبێت. ئەوانیش بریتین لە سێ گوناهی جەستەیی، چوار گوناهی زمان و سێ گوناهی رۆح. سێ گوناهی جەستە، کوشتن، دزی و زینان، چوارگوناهی زمان:درۆکردن، زمان رەشی، جنێودان وقسەی بێ مانان. سێ گوناهەکەی رۆح: چاو برسییەتی، رق و لادان لەرێگای راست. بۆیە ئەم فەرمانانەتان پێ رادەگەیەنم: قەتاوقەت نەکوژی، بەڵکو رەچاوی ژیان بکە، هەرگیز دزی نەکەی، شتێک نەرفێنی، بەڵکو یارمەتی ئەوانی تر بدەن تاکو سوود لەبەری کارەکانیان وەرگرن. خۆت بپارێزە لە هەموو جۆرە ناپاکییەک و هەمیشە داوێنپاک بە.

... رێ مەدە هزری خراپ دزە بکاتە دڵتەوە تووڕەیی لە خۆت دووربخەرەوە...» [١٥]

٥- «کەواتە با بە خۆشبەختی بژین، بەبێ رق بوونەوە لەو کەسانەی کە



رقیان لە ئێمەیە! لەنێو ئەو کەسانەدا کە رقیان لە ئێمەیە، با بەدوور لە هەموو رقێک بژین.» [١٦]

٦- «وابێت کە هیچ یەکێکتان ئەوی تر فریو نەدات، هیچ کەسێک ئەوی تر بەکەم نەزانێت، هیچ کەسێک لەرێی تووڕەکردن و نەفرەتەوە ئازاری ئەوی تر نەدات.» [١٧]

٧- نەزانێک کە زانیبووی بوودا پەیرەوی لەپرەنسیپی ئەوینی بێ سنوور دەکات کە حوکمەکەی چاکەیە لەبەرامبەر خراپە، بوودای بینی و جنێوی پێدا. بوودای پڕ لە دڵسۆزی لەبەر نەزانیی ئەو بێ دەنگ بوو. ئەو کاتەی کە ئەو دەستی لە جنێودان هەڵگرت، بوودا لێی پرسی:«کورم، ئەگەر کەسێک ئەو دیاریەی کەپێی دەبەخشرێت پەسەندنەکات، ئەو دیارییە بۆ کێ دەبێت؟» پیاوەکە وەڵامی دایەوە:« لەوکاتەدا بۆ ئەو کەسەیە کە دیاریەکەی پێشکەشکردووە». بوودا گوتی:«کورم، تۆ جنێوت پێدام، بەڵام من جنێوەکانی تۆم پەسەند نەکردن و هیوادارم بۆ خۆت هەڵیانگری. ئایا ئەوانە نابنە مایەی لەناوبردنت؟ وەک چۆن دەنگدانەوە(Reflex) هی دەنگەو سێبەریش موڵکی جەستەیە، بێگومان خراپەش خراپەکار ئازار دەدات.»

پیاوەکە وەڵامی نەدایەوە بووداش بەوشێوەیە بەردەوام بوو:«خراپەخوازی کە مرۆڤی بەرێز بێ رێز دەکات بۆ کەسێک دەمێنێتەوە کە تف لە ئاسمان بکات. ئاوی دەمی ئاسمان پیس ناکات، بەڵکو دێتە خوارەوەو بەرخۆی دەکەوێ و خۆی پیس دەکات... پیاوی جنێودەر بەشەرمەزارییەوە رۆیشت، بەڵام گەڕایەوە و پەنای بۆ بودوا، دارما(Dharma) [ تەقوا] سانگا (Sangha) (چینی نەجیب و پەیرەوانی بودا) برد [١٨].

**٣- بهەگەڤاد - گیتا:**

بهەگەڤاد-گیتا (Bhagavad-Gita) پڕ خوێنەرترین و بەنرخترین کتێبی

کولتووری هیندۆسە. بەگوتەی رای بهادور لال  بایجنات(Rai Bahadur Lal Baijnath) لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، هێشتا« تاکە کتێبە بۆ هیندۆسەکان». هەروەها گیتا لە رۆژئاواش خوێنەر و ستایشکاری زۆرن. لەنێو کەسایەتییە رۆژئاواییەکاندا کە ئەم کتێبەیان خوێندۆتەوە دەتوانین ناوی کەسایەتییە زۆر بەناوبانگەکانی وەکو هیگڵ، شۆپنهاوەر، ئێمەرسۆن، تورو، ئەلبێرت شوایتزەر و زۆر بیریار و نووسەرانی تر ببەین.

بەڵام ناوبانگی جیهانی ئەم بەرهەمە قەرزاری چییە؟ بهەگەڤاد-گیتا چییە؟ چۆن دەتوانین ئەم بەرهەمە بەیەکێک لەسەرچاوە مێژووییەکانی ناتوندوتیژی بژمێرین؟

بهەگەڤاد-گیتا یاخود (سروودی پەروەردگار) بەشێکە  لە داستانی گەورەیی هیندی ماهابهاراتا(Mahabharata). ماهابهاراتا چیرۆکی شەڕێکە کە دوو لقی بنەماڵەیەک  دەخاتە بەرامبەر یەکترەوە، لە لایەکەوە پێنج کوڕی پاندو(Pandu)(کە ئەرجونا (Arjuna)یەکێکیانە)و لەلایەکەی تر مامەکەیان دهریتارشترا (Dhritarashtra) و دورجودهون(Duryadhama) لەگەڵ هەشتاو نۆ برایدا. ماهابهاراتا لەنێوان سەدەی چوارەمی پ.ز و سەدەی چوارەمی زاییینیدا نووسراوە. لەگەڵ هەموو ئەمەدا، بهەگەڤاد-گیتا کە تەنیا بەشەکانی ۲۳ تاکو ٤٠ی ئەم داستانە هیندییە گەورەیە پێکدەهێنێت لە دەوروبەری ساڵی ١٥٠ زاییینی نووسراوە.

کتێبەکە بە دیمەنێکی شەڕی نێوان دوو لەشکرەکە دەست پێدەکات. شا دهریتارشترا، مامی ئەرجونا کوێرە. ڤیاسا(Vyasa)ی زانا (نووسەری گریمانەیی ماهابهاراتا) توانای بینینی شەڕەکەی بۆ دەرەخسێنێت. بەڵام شا بە کوێری مانەوەی لەم براکوژییە پێ خۆشترە. ئەوکات ڤیاسا داوا لە سانجیا (Sanjya)ی گالیسکەچیی شا دەکات هەواڵەکانی گۆڕەپانی شەڕی بۆ بگێڕێتەوە، بۆیە دەتوانین سانجیا بەگێڕەرەوەی چیرۆک و کەسایەتیی یارمەتیدەر لەقەڵەم بدەین، کە خوێنەرانی گیتا بەهۆی ئەوەوە بە



ئامۆژگارییەکانی کریشنا و ئەرجونا ئاشنا دەبن. کریشنا(Krishna) وەکو هاودەم و گالیسکەچی ئەرجونا دێتە ناو گۆڕەپانەکەوە. بەڵام لەهەمان دەسپێکی کتێبەکەدا وەکو خوایەکی باشتر و نیشانەی هێزی بوونەوەر دەردەکەوێت کە جاربەجار دێتە سەر زەوی تاکو لەکاتی پەشێویدا سیستم بەرقەرار بکات. بەم شێوەیە ئەو ١٨ بەشەی پێکهاتەی بهەگەڤاد-گیتا پێک دەهێنن هەموویان وەک رێنمایی ئەخلاقیی کریشنا دەخرێنەڕوو.

کتێبەکەی بە رێنماییە تیۆری و پراکتیکیەکانی کریشنا لەمەڕ جەوهەری کار و خۆناسی دەست پێدەکات. ئەم رێنماییانە بە بابەتگەلێکی دیکە لەمەڕ ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان قوربانیدان و کردوەدا هەیە تەواو دەبن. پاشان داوا لە خوێنەری کتێبەکە دەکات کە لەو کێشمەکێشەی کە لە نێوان چاوپۆشی و کردەوەدا هەیە رامێنێت. ئەو کات کریشنا داوا لە ئەرجونا دەکات کە بیربکاتەوە لە مەڕ بابەتە زەحمەتەکانی تری وەکو ناسینی کریشنا، دەرکەوتن(تجلی)ی خواو باوەڕ. بەم شێوەیە لە زنجیرەی ئەو گفتوگۆیانەی کە کۆی بهەگەڤاد-گیتا پێکدەهێنن، رێنماییە رۆحییەکانی کریشنا ئەرجونا دەگۆڕن، کە بەنۆرەی خۆیان دەبنە مایەی خۆشویستنی خوا (بهاکتی-Bhakti) لە ئەرجونادا. کرۆکی ئەم ئەوینە، کۆنترۆلە (یوگایە) کە ئیمکانی جڵەوکردنی شەهەواتەکان بە مرۆڤی جەنگاوەر دەبەخشێت تا ببێتە مرۆڤێکی  کۆنترۆڵبوو(یوگی).

سەرەنجام بهەگەڤاد-گیتا بەراڤەیەکی سانجیای گێڕەرەوە بەم شێوەیە کۆتایی پێدێت:

«بەم شێوەیە، وتووێژی ڤاسودێڤا (Vasudeva)م لەگەڵ کوڕە ناودارەکەی پریتا (Pritha)بیست، گفتوگۆیەکی سەیر کە مرۆڤ ناچارە ئافەرین و دەستخۆشی لێبکات. بە لوتفی ڤیاسا، من ئەم نهێنییە باڵایە، واتە یوگام لە زمانی مامۆستای یوگا کریشناوە کۆکردەوە. کریشنا، خۆی  فێرە ئەو رەمزانە دەبوو... لەوێ کە کریشنا خوای یوگا بێت، لەوێ ئەو کوڕەی کە

تیرهاوێژێکی لێهاتووە پریتا بێت، من لەو بڕوایەدام هەمیشە لەوێ بەختی باش ، سەرکەوتن و بەختەوەری هەیە.»[19]

کەواتە، بهەگەڤاد-گیتا وەک جۆرێکی لە خۆتۆژینەوە وەک وتوویژێکی بەمشتومڕ دەخاتەڕوو. لە هەر قۆناغێکی کتێبەکەدا، کریشنا لەو کێشمەکێشە مەعنەوییە کە رۆحی ئەرجونا ئازار دەدات ئاگادارە و بە رێگایەکی تایبەتی رێنمایی ئەو دەکات تاکو بتوانێت کێشمەکێشە دەروونییەکانی نەهێڵێت. کریشنا داوای لێدەکات کەس نەکوژێت. بەڵکو چاوپۆشی لە خۆشویستنی بەری کردەوەکانی بکات، ئەرجونا فێر دەبێت کە چۆن بەسەر هەست و کردەوەکانیدا زاڵبێت، بەبێ ئەوەی گۆڕەپانی جەنگ جێبهێڵێت. لەگەڵ ئەوەی  کە هەموو وتوویژەکانی نێوان کریشنا و ئەرجونا لە گۆڕەپانی جەنگدا روو دەدەن، بهەگەڤاد-گیتا بەرهەمێک نییە کە سەرمایەکەی توندوتیژی بێت. تەواو بە پێچەوانەوە،گیتا بانگەشەی پشتیوانیکردن لە«ahimsa» (ناتوندوتیژی) دەکات. کریشنا لە میانەی رێنماییەکانیدا بە ئاشکرایی توندوتیژی و کاری خراپ سەبارەت بە ئەوانی تر رەتدەکاتەوە.

بەم شێوەیە تیۆری ئەخلاقی بهەگەڤاد-گیتا تەنیا تایبەت نییە بە شەڕی براکوژی لە ماهابهاراتا دا، بەڵکو پەیوەستە بە هەموو جەنگەکان. بەگوتەی فەیلەسووف و زانای بەناوبانگی هیندی شری ئۆربیندۆ(Sri Aur-bindo)، لە کتێبی چەند نامەیەک لەمەڕ گیتا: «ژیان گۆڕەپانی جەنگ و مەیدانی مردنە، ژیان Kuruksetraیە».[20] هەروەها گاندیش لەو بڕوایەدایە، چونکە ئەو جەنگەی لە ماهابهاراتادا وەسفکراوە بە«نموونەیەکی بێ ژێدەری مێژوویی»[21] ناودەبات. هەروەها ماهادیڤ. داسای، پاڵپشتی لە بۆچوونی گاندی دەکات. بەبڕوای ئەو بە هیچ شێوەیەک ناتوانین بهەگەڤاد-گیتا بە وتوویژێکی مێژوویی دابنێین.»[22] راڤەکەری گیتا، رادا کریشنان (Radha Krishnan)یش کۆکە لەگەڵ ئەوانی



تر و بەراستی دەڵێت کە لە بهەگەڤاد-گیتا دا «زیاتر لەجاران لە رەنگدانەوەکانی گۆڕەپانی جەنگ دووردەکەوینەوە بۆ ئەوەی لە وتوویژی نێوان خوا و مرۆڤ نزیک ببینەوە.»[23]

کەواتە ناتوندوتیژی جێگەی لە دڵی بهەگەڤاد-گیتادا گرتووە. لەم کتێبەدا، پەیڤی«ahimsa » چوارجار (لە بەشەکانی ٥:١٠، ١٣:٧، ١٦:٢، ١٧:١٤) دووبارە دەبێتەوە. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، ئەم چەمکە وەک حوکمێکی رەها نەهاتووە. کرۆکی ناوەندی  بهەگەڤاد-گیتا مەسەلەی ناتوندوتیژی نییە، لەگەڵ ئەوەشدا فەلسەفەیەک دەهێنێتە پێش کە بنچینەی ناتوندوتیژی بەهێز و جێگیر دەکات. جەوهەری رێنماییەکانی گیتا، توانای پەسەندکردنی کردەیە بەبێ نیگەرانبوون لەمەڕ بەری ئەو کردەیە. گیتا داوا لەخوێنەر دەکات لەرێی وازهێنان لەهەموو جۆرە خۆشەویستی و بەرژەوەندیخوازییێکی کەسی رێگای بەرزی مەعنەوییەت هەڵبژێرێت.

ناتوندوتیژی لەنێو ئەو بیست و شەش سیفەتەدایە کە پێویستە لەتاکدا هەبن تاکو بتوانێت بەم بەرزییە بگات. کەواتە پەیامی گیتا زۆر روونە. ئامۆژگاری گیتا بۆ مرۆڤەکان ئەوەیە کە دەرفەت بەنیگەرانی نەدەن، چونکە نیگەرانی و هەراسانی سەرچاوەی خەم و کۆڤانن. بۆیە پێویستە هزرت ئارام و ئاسوودە بێت. چونکە جەستە و هەست لە مرۆڤدا بە بنچینە ناژمێردرێن، بەڵکو رۆحەکەی بنەمایەکی نەگۆڕ و لەناو نەچووە. بۆیە لەگیتا دا هاتووە: «تەسەورکردنی ئەوەی کە کەسێک یەکێکی تر دەکوژێت، بیرکردنەوە لەوەی کەسێک دەکوژرێت، سەرتاپا هەڵەیە؛ نەکەسێک دەکوژێت و نەکەسێک دەکوژرێت»[24] کەواتە جێگەی  خۆیەتی ئێمەش وەکو ڤینۆبا بهاڤە(Vinoba Bhave) پێمان وابێت ئەگەر«ahimsa» (ناتوندوتیژی)و«satya»  (راستی) سەرەتا و کۆتایی یوگای دوا مەبەست بن کە لە گیتادا لەلایەن خواوە فێرە مرۆڤ دەکرێت، پێویستە ئەوە پەسەند

بکەین کە ئەم کتێبە بنچینەیەکی گرنگی فەلسەفەی ناتوندوتیژییە.

**چەند دەستەواژەیەکی بهەگەڤاد-گیتا:**

١- ناتوندوتیژی، جێگیریی ڕۆح، ڕازیبوون، پەشیمانی، خێر، ناوبانگ، هەموو شێوە جۆراوجۆرەکانی بوونی پێش منی تەنیایە. (١٠:٥)

٢- خاکەڕایی (التواضع)، ڕاستگۆیی، دانبەخۆداگرتن، دەستپاکی، ڕێزگرتن لە مامۆستا، خاوێنی، بڕوای یەقین، خۆدوورگرتن لە خراپە (تەقوا). (١٣:٧)

٣- ناتوندوتیژی، ڕاستی، دانبەخۆداگرتن، لێبووردن، ئارامی، ڕاستگۆیی، دڵسۆزی، کەس ئازارنەدان، میهرەبانی، شەرم، ئاسوودەیی خەیاڵ. (١٦:٢)

٤- ئایینی خوایەکان، براهمانەکان، مامۆستاکان و زانایان، خاوێنی، داد، داوێن پاکی و ڕێزگرتن لە ژیان، ئەوانە ریازەتی کارن. (١٧:١٤)

## ٤- جەینیزم

جەینیزم (Jainisme) یەکێکە لە بزاڤە مەعنەوییە گەورەکان کە لە ماوەی قۆناغی پاش ڤداییدا، لە دەوروبەری سەدەی پێنجەمی پێش زایین، هزری هیندی فۆرمەلەکرد. لەم ڕوانگەیەوە، جەینیزم نەریتێکی ئایینی هاوکاتە لەگەڵ بوودایی‌یزم. لەڕاستیدا، جەینیزم وەکو بوودایی‌یزم، ڕووبەڕووی ئەو خەلەلە دەبێتەوە کە لە هیندۆسیەتدا دروست بووە و پیادەکردنی کاستیزم (Castisme) دەخاتە ژێر پرسیارەوە. لە دەوروبەری سەدەی پێنجەمی پ.ز، بوودا گوتاما ڕێبازی چوار ڕاستیی پیرۆز (Catvariarya Satyani)ی ڕاگەیاند و ڕەنج و نا بەردەوامیی ژیانی مرۆڤی بەڕاست زانین. لە هەمان سەردەمدا، ڤارادهامارما جناتیپوترا (Vardhamarma Jnatiputra)ی زانا کە دواتر بەماهاڤیرا(Mahavira=پاڵەوانی گەورە) ناسرا شێوازی زاڵبوون بەسەر هەستەکاندای لە ڕێگای قەدەغەکردنی پەیتاپەیتاوە خستەڕوو و ڕەوشتی خۆی کردە نموونە. ماهاڤیرا لە سی ساڵیدا ماڵەوەی بەجێهێشت و ماوەی دوانزە ساڵان لەپێناوی دۆزینەوەی ڕێگای ڕزگاربوون ئاواریی هەڵبژارد. سەرەنجام لە تەمەنی ٤٢ ساڵیدا ڕۆشنایی بینی و بوو بەزانای سەرکەوتووی جینا(Jina). ماهاڤیرا ڕێبازی ڕۆحانییە ڕووتەکانی بونیاتنا و ماوەی سی ساڵ خەریکی وانە وتنەوەی ئایینەکەی بوو. ئەو لە ساڵی ٤٦٨ پ.ز، لە تەمەنی حەفتا و دوو ساڵیدا لە پاتنا(Patna) کۆچی دوایی کرد.

ئەمڕۆ کەسایەتی ماهاڤیرا بابەتی ڕێبازێکە لە هیند. کەواتە جەینیزم واتە ئەو ڕێبازەی کە لەلایەن جینایەکەوە خراوەتەڕوو. جیناکان ئەو کەسانەن کە بە جڵەوکردنی شەهەواتە دونیاییەکانیان، واتە بە جڵەوکردنی پێنج هەستەکان بە مەعریفەی باڵا گەیشتوون. جینا لەڕێی گۆڕینی ڕێگای «کارماکان»، بە مەعریفەی باڵا دەگات و ئەو تەمەنەی کە ماویەتی لە«دارما پرابهاڤانا» (Dharma prabhavana)دەگوزەرێنێت و خەڵکان فێرە پڕەنسیپەکانی جەینیزم دەکات. هەروەها لەبەر ئەم ئەرکە بەرزەیە کە هەر جینایەک بە «تیرسێنکارا» (Tirhthankara)یش ناودەبرێت، واتە ئەو کەسەی کە بۆ مرۆڤەکان بە لەمێک لە«دارما» دروست دەکات و بۆ پەڕینەوە لەزەریای ژیان یارمەتیان دەدات.

بەپێی یەکەمین پڕەنسیپی جەینیزم، مرۆڤ بوونەوەرێکی دوالیزمییە، واتە هەم ماددییە و هەم مەعنەوی . بە دەستەواژەیەکی تر، مرۆڤ بوونەوەرێکی تەواو و کامڵ نییە. چونکە ڕۆحی «جیڤا»(Jiva) ئەو شوێنە پەسەند دەکات کە «کارما» بەسەریدا دەسەپێنێت. بۆیە، ڕۆحی مرۆڤ بە دونادون(تناسخ)ە جۆراوجۆرەکاندا تێدەپەڕێت و ڕەوڕەوەی ئافریدەکان (Samsara) دەبڕێت، هەندێک جار لەشێوەی جوان و هەندێک جار لە

شێوەی ناشیریندا. بەم جۆرە کاتێک کە مادە دەسەڵاتەکەی بەتەواوی پیادە بکات، «کارما» هەموو کاریگەرییەکەی جێ دەهێڵێت. لەم روانگەیەوە، جیهان لەنێوان گیاندار (جیڤا) و غەیرە گیاندار یاخود رەگەزی بێ گیان(ئاجیڤا–Agiva) دا دابەش بووە. فەلسەفەی جەینیزم بە گشتی لەسەر کردەی بەرامبەری نێوان ئەم دوو بنەمایە راوەستاوە. بەمانایەکی تر، کردەی بەرامبەری نێوان هەر شتێکی گیاندار و هەر شتێکی بێ گیان ،چونکە دەبنە هۆی داهێنانی کۆڵەگەکانی ژیان وەک لەدایکبوون، مردن و تد...

بەپێی جەینیزم پێنج رەگەزی بێ گیان رووبەڕووبووی رۆح دەوەستن: مادە، فەزا(Akasa) ، کات(Kala)، «دارما» (هۆی جووڵە) و ئادارما (هۆی جێگیری=Adharma) . هەلومەرجە گشتییە هەبییەکان بەم شێوەیە پێناسەکراون. پێویستە ئێستا ببینین بە چ شێوەیەک مادە وابەستەیە بە رۆحەوە. «کارما» کە بەخۆی مادییە و لەرێگەی پرۆسەیەکەوە کە پێی دەڵێن «ئاسراڤا»(Asrava)وابەستەیە بەرۆحەوە، وا لە رۆح دەکات کە بەردەوام لە دایکبێتەوە (سامسارا) و بەم شێوەیە شوێنێکی -Band (ha=بەردەوام) بەسەردا دەسەپێنێت. کەواتە رۆح بۆ ئەوەی لە جەستە بەولاوە تر بڕوات پێویستی بە یاسای ئەخلاقییە بۆ ئەوەی رێگاکانی پێ پیشان بدات.

بنەما ئەخلاقییەکانی جەین لە پێنج رێنمایی یاخود فەرماندا هاتوون کە پێیان دەڵێن«Vartas» . پێویستە لەهەموو هەلومەرجەکاندا ئەم خواستانە رەچاو و جێبەجێ بکرێن. یەکەم قەدەغەکردن، یاسای حەقیی «ahimsa» (ناتوندوتیژی)یە.

لەلای پەیڕەوانی جەینیزم «نەکوشتن» یاسای باڵایە. کەواتە هەر رۆحانییەکی جەین پێویستە خۆی بپارێزێت لە کوشتنی هەموو بوونەوەرێک. چونکە لە جەینیزمدا شەڕ، ئازاردان یان لە ناوبردنی بوونەوەران گەورەترین تاوانە. سوترا (Sutra)کانی جەینیزم، وەکو



ئاکارانگا–سوترا(Acaranga-Sutra)و شوستراکرتانگا– سوترا-Sustrakrtan) (ga-sutra لە هەموو لاپەڕەیەکدا دووپات دەکەنەوە کە کوشتن (himsa) گوناهێکی گەورەیە. کەواتە بەپێی ئاکارانگا–سوترا(١و١و٤و١) «نابێت هیچ گیانلەبەرێک بکوژرێ، نە فەرمانی کوشتنی بدرێ، نەبکرێ بەکۆیلە، نە ئەشکەنجە بدرێ و نەهێرشی بکرێتە سەر.»[٢٥]

بەم شێوەیە، پێویستە هەموو رۆحانییەکی جەین رێز لە ژیان بگرێت لەهەموو شێوەکانیدا، چ مرۆڤ بێت، چ گیانەوەر، گیا، ئاو یاخود تەنانەت ئاگریش. بەو پێیەش ئاگرکردنەوە قەدەغەیە، چونکە بەپێی رێنمایی شوستراکدتاگا–سوترا(٦و٧و١) «ئاگرکردنەوە وەکو کوشتنی بوونەوەران وایە و کوژاندنەوەی ئاگر کوشتنیەتی؛ کەواتە ئەو مرۆڤە زانایەی کە بایەخ بە یاسا دەدات ئاگرناکاتەوە.»[٢٦] بۆیە پێویستە بۆ چاکەخوازی سەبارەت بە هەموو بوونەوەران، توندوتیژی بخەیتەلاوە. جگە لەوەش پێویستە خۆت بپارێزی لە درۆکردن و چاوپۆشی لە هەموو جۆرە خاوەندارییەک بکەی. کەواتە پیاوی ئایینیی جەین، ahimsa بەهەموو شێوەکانییەوە لە چالاکییەکانی لەشی، زەینی و قسەکردنیدا بەکاردەهێنێت. زاهیدی جەین ئاوارەیی دەگرێتەبەر. خاوەنی هیچ شتێک نییە، هەرگیز ئاگر ناکاتەوە. تەنیا ئاوی هەڵقوڵاو و کانی دەخواتەوە. هەمیشە بە پێی پەتی رێگە دەبڕێت و بۆ ئەوەی زەوی ئازار نەدات هەرگیز هیچ هۆیەک بۆ جێگۆڕکێ بەکارناهێنێت. بەدی هاتنی خود ئەو کەماڵەیە کە داوای دەکات و ahimsa یاسای باڵایە (ahimsa paramo dharma) بۆ گەیشتن بەم ئامانجە.

**چەند رێنماییەکی جەینیزم:**

١– «هەموو بووێک لەئازار بێزارە، کەواتە نابێت بیانکوژی. نموونەی کامڵی زانایی نەکوشتنی زیندەوەرانە.»[٢٧](کریتانگا–سوترا ٣ و١و١٠و١)

٢- ئەو مرۆڤە زانایەی کە بیری ڕۆشن بۆتەوە پێویستە خۆی لە تاوان دووربگرێت، ئەوکات ئەو خراپیانە دەبینێت کە لە کوشتنەوە سەرهەڵدەدەن...»[٢٨](سوترکاریتانگا- سوترا -Sutrkaritanga sutra٢١و١٠و١)

٣- ئەوەی گیانەوەران ئازار دەدات، تێ ناگات و خۆی لە تاوان بەدوورناگرێت...)[٢٩](ئاکارانگا- سوترا ٦و٦و١و١)

٤- «ئەی مامۆستا! یەکەمین بەڵێنی گەورە خۆبەدوورگرتنە لەئازاردانی بوونەوەران. من خۆم لە هەموو جۆرە ئازاردانێکی بوونەوەرە ورد و گەورەکان، بزۆک یاخود وەستا و بەدووردەگرم. من هیچ زیندەوەرێک ئازار نادەم، نابمە هۆی ئەوەی ئەوانی تر ئازاریان پێ بگەیەنن و ئازاردانیان پەسەند ناکەم. من لە ژیاندا، دەست بۆ [هیچ یەکێک لە] سێ جۆر [کاری زیانمەند]ی ڕۆح، قسەکردن و جەستە نابەم. نابمە هۆی ئەوە و پەسەندی ناکەم. ئەی مامۆستا [لە گوناهە کۆنەکانم] پەشیمانم، سەرزەنشتیان دەکەم، بە ناڕاستیان دەزانم، من واز لە ئاتمان(atman) ی خۆم [لەگەڵ ئەو شتەی کە شایستەی سەرزەنشتە] دەهێنم. ئەی مامۆستا! من یەکەمین بەڵێنی گەورە بەجێ دەگەیەنم. خۆبەدوورگرتن لە ئازاردانی هەموو بوونەوەران.»[٣٠](داساسروتاسکاندها-سوترا-Dasarutaskanda sutra) ١١و٤)

**٥- زەردەشت و ئایینی زەردەشتی**

زەردەشتییەت ئایینێکە لەجیهاندا کەمتر ناسراوە. ئەمەش لەبەر چەند هۆیەکە. ئەم نەناسراوییەی، یەکەم لەبەر کەمی ژمارەی زەردەشتییەکان(٢٠٠,٠٠٠کەس)ە. جگە لەوەش، زۆربەی ڕۆژئاواییەکان ئەوەی کە نیچە بە «Zarathoustra»ی ناودەبات تێکەڵ بە زەردەشت، پێغەمبەر و زەردەشتییەت کردووە. سەرەنجامیش، هەروەها ژمارەیەکی زۆر کەم لێکۆڵینەوەی ناپسپۆڕی تایبەت بەم ئایینە ئەنجام دراون.





زۆربەی ئەو بەرهەمە ژێدەرییانەی کە لە ئایینی زەردەشتییان کۆڵیوەتەوە بە دەستی گەورە پیاو و زانایانی مێژووی ئایین و پسپۆڕە ئێرانییەکانی کۆن نووسراون. زۆربەی خوێنەرە ئاساییەکان بە زەحمەت لەم بەرهەمانە تێدەگەن. بەم شێوەیە خەڵکی بازاری بە بەردەوامی ئایینی زەردەشتی بە ئایینی ئاگر و زەردەشتییەکان بە ئاگرپەرست دەزانن. لەگەڵ ئەوەی لە ئایینی زەردەشتیدا ئاگر ڕەگەزێکی پیرۆزە، وێڕای ئەوەش پێویست بوو بە خۆ دوورگرتن لە وتەی سەرتاپاگیر، گرنگیی فەلسەفی-ئەخلاقی ئەم ئایینە بەکەم نەزانین. لەبەر دوو هۆ، یەکەم، ئەم ئایینە کاریگەرییەکی زۆری کردۆتە سەر هزری یونانی و ئەفلاتوونییە نوێیەکان. دووەم، دەتوانین ئەم ئایینە بە یەکێک لە سەرچاوە سەرەکییەکانی هزری دادپەروەریخوازی و ناتوندوتیژی لە قەڵەم بدەین. لەگەڵ ئەوەی کە زەردەشت پێغەمبەری چاکسازی و کردەوەیە نەک پێغەمبەری چاوپۆشین و وەستان، لە هەموو ڕوویەکەوە ئەو پێغەمبەری ئاشتی و ئومێدە.

جیاوازییەکی زۆر لە نێوان پسپۆڕەکانی ئایینی زەردەشتیدا لەمەڕ مێژووی لەدایکبوون و مردنی زەردەشت هەیە. «دوورترین کات کە بۆ زەردەشتیان داناوە سەدەی هەژدەیەمی پ.ز، و نزیکترینیشیان سەدەی شەشەمی پ.ز»[٣١].«مەوی بویس (M.Boyce) ماوەی نێوان ١٤٠٠ و ١٢٠٠ پ.ز، پێشنیار دەکات.»[٣٢] بەپێی نووسینە پیرۆزەکانی ئایینی زەردەشتی، زەردەشت ئەو پێغەمبەرەیە کە لەکاتی لەدایکبووندا پێدەکەنی. سەرەڕای ئەوە، سروشتیش بە لەدایکبوونی زەردەشت شادمان بووە، لەکاتێکدا کە هێزە خراپەکارەکان بە قووڵایی زەویدا چوونەتەخوار. بەبڕوای پسپۆڕانی ئێرانی کۆن، ناوی «زەردەشت» لەزاراوەی لاتینی«Zoroastres» وەرگیراوە، بەڵام لە ئاڤێستا (کتێبی پیرۆزی زەردەشتییەکان) دا ئەم ناوە بەشێوەی «zarathustra» هاتووە. دەستەواژە پەهلەوییەکەی«Zaratust»ە، (بەڵام) ئێستا لە فارسی ئەمڕۆدا بە زەرتوشت (زرتشت) یاخود

زەردوشت«zardosht» ناوی دەبەن. ئەم ناوە لە دوو وشـــــــە پێک هاتووە:«زەر» (zar) بەمانای «پیر» یان «تووڕە» و «ئوشترا» (ustra) واتە وشتر(=خاوەنی وشتری پیر یاخود تووڕە)[٣٣].

لە نووسینە پیرۆزەکانی ئایینی زەردەشتیدا هاتووە کە زەردەشت پێغەمبەر دوو جار بە ویستی خوا لە مردن رزگاری بووە. لە کاتی منداڵیشدا گورگ و ئەسپەکان ئەویان لە هێزە خراپەکارەکان پاراستووە. زەردەشت لە تەمەنی بیست ساڵیدا ماڵەوە بەجێدەهێڵێت تا رێگای راستی و دادپەروەری بدۆزێتەوە. بیست ساڵ دواتر رووناکی ئیزەد بەشێوەی گەورەی فریشتەی ڤۆهۆ مانا(Voho Manah) دەبینێت. بۆ ماوەی دە ساڵ، فریشتەکە زەردەشت بەرە و ئاهورامەزدا، واتە ئیزەدی باڵا رێنمایی دەکات. بەم شێوەیە زەردەشت چەندین جار لەگەڵ ئاهورامەزدا و شەش ئامشا سپێنتاس (Amsha Spentas) دیدار دەکات و فێرە پرەنسیپەکانی راستی و چاکە دەبێت، بەڵام لە ماوەی ئەم دە ساڵەدا تەنیا دەتوانێت یەک کەس بێنێتە سەر رێبازەکەی، ئەویش کوڕە مامەکەیەتی کە ناوی مایدیۆماه= Maidhyomah ە. بەڵام دوای دوو ساڵ لەگەڵ شا ڤیشتاسەپ رووبەڕوو دەبێتەوە و دەعوەتی دەکات بۆ ئایینەکەی. بۆیە، پێشەوا ئایینییەکان پیلان لە دژی دەگێڕن. زەردەشت بەتاوانی جادوگەری دەخرێتە زیندانەوە. لەهەمان کاتدا، ئەسپە خۆشەویستەکەی شا ئیفلیج دەبێت، زەردەشت هەوڵی چارەسەرکردنی ئەسپەکە دەدات بەمەرجێک شا پەیوەندی بکات بە ئایینی نوێوە.

شا ئایینەکەی پەسەند دەکات و زەردەشتییەت دەبێتە ئایینی رەسمی دەرباری ڤیشتاسەپ. لەماوەیەکی کەمدا ئایینی نوێ لە سەرتاسەری وڵاتدا بڵاودەبێتەوە. بەپێی چیرۆکە تەقلیدییەکان، زەردەشت سێ جار ژن دەهێنێت. دەبێتە خاوەنی سێ کوڕ و سێ کچ، سەرەنجام لە تەمەنی ٧٧ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات. لە چیرۆکە کۆنەکاندا هاتووە کە زەردەشت لە



کاتی پەرستندا لە پەرستگا بەدەستی تورانییەکان دەکوژرێت[٣٤].

لە بنەچەدا ئایینی زەردەشتی لەسەر بۆچوونێکی دوالیزمی لەمەڕ جیهان راوەستاوە. سیستمی ئیزەدی دوو بنەمای لە جیهاندا هەیە: لەلایەکەوە چاکە کە ئیزەدی باڵا سمبۆلەکەیەتی، بەرجەستەبوونی راستی و رووناکییە. لەلایەکەی ترەوە خراپە کە نیشانەی تاریکی، وێرانی و ستەمە. بەم شێوەیە بیرۆکەی چاکە و دادپەروەری لەم ئایینەدا پایەیەکی بەرزیان هەیە. لە ئایینی زەردەشتیدا، دادگەری نەک بەتەنیا لەمەڕ مرۆڤ بەڵکو لەبارەی گیانەوەرانیشەوە پیادە دەکرێت (بگەڕێوە بۆ یەسنی٢٩- سروودی گوشورڤان کە گا سکاڵا لە دڵڕەقیی مرۆڤ دەکات لەلای ئیزەدی نەمر).

دەتوانین جوانترین دەستەواژەکانی ئایینی زەردەشتی لە یەسنەکاندا بدۆزینەوە کە لە دوعا، پەسەندکردن و دانپێدانانەکان پێک دێن. لەنێوان حەفتاو دوو هات لە یەسنەکاندا، حەڤدە هات لەو پێنج گاهانەن کە کۆنترین بەشی ئاڤێستا و هەروەها کۆنترین بەرهەمی ئەدەبی ئێرانین کە ماونەتەوە. زەردەشت خۆی ئەم سروودانەی وتوونەتەوە؛ یەسنەکانی هاپتان هایتی پەخشانن و لە پاش گاهەکان کۆنترین بەشی ئەڤێستان.

١- ئاهوناڤایت (Ahunavaiti) (یەسنی٢٨ تاکو ٣٤)
٢- ئوشتاڤایت (Ushtavaiti) (یەسنی ٤٣ تاکو ٤٦)
٣- سپێنتا مایینتو (Spenta Mainyu) (یەسنی ٤٧ تاکو ٥٠)
٤- ڤۆهۆخشاترا (Vohu Xshathra) (یەسنی ٥١)
٥- ڤاهیشتویشت (Vahishtoishti) (یەسنی ٥٣)
و یەسنەکانی هاپتانهایتی (Haptanhaiti) (یەسنی ٣٥ تاکو ٤١)

بۆ زیاتر روونکردنەوەی گوتەکانمان، چەند دەستەواژەیەکمان لە گاهەکان هەڵبژاردوون. ئەوانە خۆیان بە تەنیا نیشاندەری پایەی چاکە و بەتایبەتی دادپەروەرین لە ئایینی زەردەشتیدا. بەم شێوەیە، وەکو دوشن-گی مان

(Jacques Duchesne-Guillemin) نووسـیـویەتی:«خـوای زەردەشت خـوای دادپەروەریە». لە راستیدا بە بۆچوونی ئایینی زەردەشتی، بەختەوەری بەبێ دادپەروەری قەتاوقەت نایەتە دی.

## چەند دەستەواژەیەک لە گاھەکان

١- پێویستە توورەیی بخرێتە لاوە! ستەم لەخۆتان دورخەنەوە، ئەی ئەو کەسانەی کە دەتانەوێ پاداشتی خووی چاکە شایانی ئێوە بێت، بەهۆی ئایینی راستەقینە کە هاوکارەکەی پیاوی پاکە ئافەریدەکانی لە کۆچک و سەرای تۆدا دەبن.

(یەسنی ٤٨)

٢- ئەی ئاهورا، ئەی ئوردیبێهێشت، ئەی بەهمەن هێزو توانایان پێ ببەخشە، ئەوان دەتوانن خانووبەرەیەکی باش و تەنایی ببەخشن، منیش لەو بڕوایەدام، ئەی مەزدا تۆی یەکەمین دروستکەری ئەوە.

(یەسنی ٢٩)

٣- لە کوێ بۆ رەنجی کرێ لەسەرپێ بوەستێت و لە کوێ لێخۆشبوون هەیە؟ لە کوێ راستییان دەست دەکەوێت؟ لە کوێ خۆپارێزی خاوێن؟ لە کوێ خووی باشتر؟ لە کوێ ولاتی (بەهەشتی) تۆ هەیە، ئەی مەزدا؟ (یەسنی ٥١)

٤- ئەی باوکی پاکی ئەم (سپەند)ەی بەهەشت کە کەری بەچوار پێی وەکو ئێمە دەبەخشی، بخولقێنەو ئەوکات ئارامی بە کێڵگەی سپینداران ببەخشە، دوای ئەوەی، ئەی مەزدا، ئەو بەخووێکی باشەوە پرسیاری کردو وەڵامی دایەوە.

(یەسنی ٤٧)

٥- بەئەوان مەزدا ئاهورا، (خوای) بە خوویەکی چاکی بێ هاوتاو دۆستی باش، راستی درەوشاوە بە هێزەوە وەڵامی دایەوە: لەبەر خۆپارێزی پاک



و خاوێنتان تۆم هەڵبژاردووە کە لە ئێمە بێت.

(یەسنی ٣٢)

٦- گوشۆرڤان (گیانی گا) گلەیی لە ئێوە کرد، بۆکێ ئێمەت خوڵقاندووە، کێ ئێمەی دروست کرد؟

توورەیی و ستەم و دڵڕەقی و توندی و زۆرداری ئێمەیان تەنگیان بەئێمە هەڵچنیوە. ئێمە جگە لە تۆ پاسەوانێکی ترمان نییە. ئێستا چاکەی جوتیارم پێ ببەخشە.

(یەسنی ٢٩)

٧- ئەی مەزدا، کێ پشتیوانی کەسێکی وەک من دەکات، ئەوکاتەی کە درۆ پەرست بۆ ئازاردانی من ئامادە دەبێت، جگە لەئارەزوو و خووی تۆ کە لە کردەوەکانیان ئایینی راستەقینە پێدەکات؟ ئەی ئاهورا، لەم یاسایە دەروونم ئاگاداربکەرەوە.[٣٥]

(یەسنی ٣٥)

### ٦- سوقرات: پەیڕەویکردن لە یاساکانی دەوڵەتشار

سوقرات بە دامەزرێنەری فەلسەفە لەرۆژئاوا دادەنرێت. بەڵام لە ئەدەبیاتی رۆژئاوادا کەمتر وەکو یەکێک لە روخسارەکانی ناتوندوتیژی باسی لێوەکراوە. سوقرات لە ساڵی ٤٧٠پ.ز لەئەسینا لەدایک بووە. دایکی مامان و باوکی پەیکەرتاش بوو. سوقرات هاوسەردەمی پریکلیس، سۆفۆکلیس و یۆریپید بوو. بۆیە، یەکێکە لە شایەدە بەرچاوەکانی سەردەمی گەورەیی و هەرەسی دیموکراسیی سەدەی پێنجەمی پ.ز لە ئەسینادا.

گوتوویانە کە زۆر ناشیرین بووە، لووتی پان و سەری کەچەڵ بوو. گزێنۆفۆن دەموچاوێکی زۆر نارێکی لە سوقرات وێنەکێشاوە، لەکاتێکدا کە ئەفلاتون لە گفتوگۆبەکانیدا رووخسارێکی ئایدیالی بۆ دروست دەکات

و به نوێنەری روانگه فەلسەفییەکانی خۆی دەناسێنێت.

سوقرات نفوزێکی سەرسوڕهێنەری هەبوو لەنێو لاوەکانی ئەسینادا. له رووی ئازایی و زاناییەوە ستایشیان دەکرد. چونکه لەگەڵ ئەوەی که جلێکی هەژارانەی دەپۆشی، روحێکی زۆر دەوڵەمەندی هەبوو و له قسەکردن لەگەڵ رکابەرەکانیدا قەت تووڕه نەدەبوو. لەساڵی ٣٩٩ پ.ز ئانیتۆس (Anytos) و دوو له هاوکارەکانی سوقراتیان بەوە تاوانبارکرد که بڕوای بەو خوایانه نییه که له کۆمەڵگادا پەسندکراون، و لاوەکانی ئەسینا گومڕا دەکات. سوقرات له دادگادا بەتەنیا هەڵسا به بەرگریکردن له خۆی، و هاوکاریی لیزیباسی رەتکردەوە. بەڵام به ٢٨١ دەنگ له بەرامبەر٢٧٨ دەنگدا به تاوانبار له قەڵەم درا. سوقرات یەکسەر له سێداره نەدرا، بەڵکو خرایه گرتووخانەوە. چونکه دەبوو وەک نەریتی ساڵانه چاوەڕوان بێت تا ئەو کەشتییەی که دیارییەکانی ئەپۆلۆنی هەڵگرتووه له دەلۆس (De-los)دەگەڕێتەوە. سوقرات له ماوەی ئەو سی ڕۆژانەی کۆتایی تەمەنیدا، لەگەڵ قوتابییەکانی له وتوویژدا بوو.

ئەفلاتوون ئەو وتوویژانەی لەدوو گفتوگۆی گرنگدا کۆکردوونەتەوە: ستایشی سوقرات (Apologie de socrates) و کریتۆن (criton). پسپۆڕانی فەلسەفەی ئەفلاتون، بەزۆری «کریتۆن» به درێژبووەوەی «ستایشی سوقرات»ی دادەنێن. بەم پێیه به گفتوگۆیەکی بچووک دەژمێردرێت له کۆی بەرهەمەکانی ئەفلاتووندا، چونکه ئەم گفتوگۆیە زیاتر راڤەیەکی بەڵگەداری ژیاننامەی سوقراته نەک سەلماندنێکی فەلسەفیی گرنگ بۆ دەربڕینی هزری ئەفلاتوون. لەگەڵ ئەوەشدا، کریتۆن گفتوگۆیەکی گرنگه بۆ هەر کەسێک که بیەوێت لەدیدگای سوقراتەوه له هزری ناتوندوتیژی بکۆڵێتەوە.

شانۆ، گفتوگۆیه له گرتووخانەی سوقرات دا. کریتۆنی هاوڕێی دێرینی سوقرات پێشنیاری هەڵاتن له زیندان بۆ سوقرات دەکات تاکو له مردن





رزگار ببێت. به بڕوای کریتۆن لەبەر چوار هۆ پێویستە سوقرات له گرتووخانه رابکات:

١- یەکەم ئەوەی که ئەگەر سوقرات مردن پەسند بکات، خۆی و هاوڕێکانی بەدناو دەبن.

٢- مردنی سوقرات مایەی خۆشحاڵی دوژمنەکانیەتی.

٣- به چوونه ژێر باری مردن، کەمتەرخەمی دەکات له ئەنجامدانی ئەرکی سەبارەت به کوڕەکانی که دەبنه هەتیو.

٤- چوارەم و کۆتایی، به مانەوه له گرتووخانەدا و رازی بوون به مەرگ، هاوڕێکانی سوقرات به کەمتەرخەم دەناسرێن که بۆچی یارمەتییان نەدا تاکو رابکات. لەگەڵ ئەوەی که رێگا و ئامراز و توانای ئەنجامدانی ئەم کارەیان هەیه.

وەڵامی سوقرات بۆ بەڵگەکانی کریتۆن روون و سادە دەردەکەوێت. هەڵاتن رەتدەکاتەوە، چونکه ئەم کاره پێچەوانەی چارەنووسیەتی. به بۆچوونی سوقرات، یاساکانی هاووڵاتیی ئەسینا چارەنووسی ئەو دیاردەکەن. هەڵاتن له زیندان پێشێل کردنی یاسای ئەسینایه که بەگوێرەی ئەم یاسایانه جێبەجێکردنی حوکمی دەرکراو ئیلزامییه. بەم شێوەیە، سوقرات بەڵگەی ئەرکی مەدەنی دەخاتەڕوو که بەپێی ئەوە هەر هاووڵاتییەکی ئەسینایی دەروەسته به رەچاوکردنی یاساکانی ئەسینا.

کەواته سوقرات هەڵاتن له زیندان رەتدەکاتەوە، چونکه لەو بڕوایەدایه که ئەم کاره هێزی یاسا و جێبەجێکردنەکەی دەخاته ژێر پرسیارەوە. به بۆچوونی ئەو، هەر کەسێک جێبەجێکردنی یاسا بخاته ژێر پرسیارەوە، یاسای پێشێل کردووه، و بەبێ یاسا دەوڵەتشار ناتوانێت بوونی هەبێت. بۆیه، سوقرات هەڵاتنەکەی به ئیهانەکردنی یاساکانی ئەسینا و سەرپێچی لێکردنیان دەزانێت. ئەم کاره راست نییه، چونکه یاسا شکێنییه. سوقرات لێرەدا دەگاته ئەو ئەنجامەی که: نابێت وەڵامی زۆرداری به

زۆرداری یاخود خراپە بە خراپە بدرێتەوە. سەرپێچیکردن لە یاسا ئەنجامدانی نادادپەروەرییە سەبارەت بەو کەسانە کە ئەم یاسایانەیان داهێناوە و پیادەی دەکەن، واتە هاوولاتییە ئەسینییەکان. کاری خۆبەدوورگرانەی سوقرات لە توندوتیژی لە هەستی دەروەستەیی سەبارەت بە یاساکانی ئەسینا و شاری ئەسینا سەرچاوە دەگرێت. سوقرات لەڕێی رازیبوون بەچارەنووس، متمانە بە پایەی خۆی دەبەخشێت وەکو هاوولاتییەکی ئەسینایی.

بە بۆچوونی ئەو، هاوولاتی ئەسینایی بوون، واتە پەسندکردنی خووی گەورەیی و پایەی بەرزی مرۆیی. بە گوتەی ئەو، بەکارهێنانی ستەم و توندوتیژیی سەبارەت بە تاکێک، بێڕێزکردنیەتی وەک بوویێکی مرۆیی. سەرەڕای ئەوە، سوقرات پێی وایە ئەرکێکی ئاوەها وەک بەرگریکردن لە دیموکراتی ئەسینا و رەتکردنەوەی بۆچوونی ئەو کەسانە وایە کە وەکو پۆلێمارک (Polemarque) پێیان وایە پیادەکردنی توندوتیژی بەرامبەر بە دوژمنانی ئەسینا، باشترین رێگەیە بۆ پاڵپشتیکردن لە خوو گەورەیی مرۆیی خۆ. کەواتە سوقرات تەنیا وەک هاوولاتییەک ژیان هەڵدەبژێرێت و بەرەو پێشوازیکردن لە مەرگ هەنگاوەنێت. پەیڕوویکردنی لە یاسا نیشانەی پابەندبوونیەتی بە چەمکی دادپەروەری. کە بە بۆچوونی سوقرات، ئەم پابەندبوونە تەنیا لە رێگەی ناتوندوتیژییەوە رەوایە.

**چەند دەستەواژەیەکی گفتوگۆی کریتۆن**

سوقرات: کەواتە بەهیچ شێوەیەک نابێت ستەم بەڕەوا دابنێین.

کریتۆن: هەڵبەتە نەخێر!

سوقرات: لەکاتێکدا کە بە هیچ شێوەیەک نابێت ستەم بەڕەوا دابنێین، کەواتە نابێت وەڵامی ستەم بەستەم بدەینەوە، بەو شێوەیەی کە خەڵک بڕوایان پێیەتی.

کریتۆن: بێگومان نابێت وابکەین.



سوقرات: بەڵام پرسیارێکی تر. کریتۆن، خراپەکردن لەگەڵ کەسێک، ئایا ئەویش رەوایە یان نە؟

کریتۆن: ئەی سوقرات، بێ گومان رەوانییە!

سوقرات: چی تر؟ وەڵام بدەرەوە، خراپەکردن لە بەرامبەر ئەو خراپەیەی لەگەڵ ئێمەیان کردووە، بەم شێوەیە، خەڵکان چییان بە مێشکدا دێت، ئەمە راستە یاخود راست نییە؟

کریتۆن: بە هیچ شێوەیەک راست نییە.

سوقرات: کەواتە بەهەر شێوەیەک رەفتاریان لەگەڵ ئێمەدا کردبێت نابێت، نە وەڵامی ستەم بە ستەم بدەینەوە، نە لە بەرامبەر خراپە لەگەڵ هاوچەشنەکانمان خراپە بکەین. کریتۆن، ئەمەم لێ وەرگرە و ئاگاداربە. داوای ئەو شتەم لێ مەکە کە پێچەوانەی بۆچوونتە، چونکە هەمیشە کەم و دەگمەنن ئەوانەی بەم شێوەیە بیردەکەنەوە...»[٣٦].

### ٧- کتێبی پیرۆز: ئاشتی و لێبوردن

زۆربەی لێکۆڵەران، چاخی کۆن وەکو دیکۆمێنتێک لەقەڵەم دەدەن کە هزری پیادەکردنی توندوتیژی بە باشتر لە هزری ناتوندوتیژی داناوە. بەڵام هەڵەیە ئەگەر سوود لە نووسینەکانی چاخی کۆن وەرنەگرین بۆ تیشک خستنە سەر چەمکەکانی وەکو ئاشتی و لێبوردن. لەکاتێکدا کە ئەم چەمکانە ئەمڕۆ لە کولتووری خواناسیدا زۆر زیندوون. هەڵبەت لێرەدا نامانەوێ تۆژینەوەیەکی مێژوویی یان تیۆلۆژی (یەزدانناسی) لە بارەی کتێبی پیرۆزەوە ئەنجام بدەین. بەڵکو تەنیا دەمانەوێت لەو چەند دەستەواژەیە بکۆڵینەوە کە بەراشکاوی لە بیرۆکەی ئاشتی و لێبوردن دەدوێن. ئێمە لەو باوەڕەداین کە لێکۆڵینەوە لەم بیرۆکانە یارمەتیمان دەدات چەمکی راستەقینەی پەیامی حەزرەتی مەسیح لەچاخی نوێدا و کاریگەرییەکەی لەسەر هەموو نەریتی مەسیحییەت دەرک بکەین. بۆ زیاتر

روونکردنەوەی ئەم وتانە، چیرۆکی حەزرەتی یوسفمان هەڵبژاردووە و بەوشێوەیە دەگێڕینەوە کە لەکتێبی دروستبوون (٣٧-٥٧) دا هاتووە.

حەزرەتی یوسف لەگەڵ یازدە برا و یەعقوبی باوکی لە ناوچەی کەنعان دەژیا. باوکی، یوسفی لە براکانی دیکەی زیاتر خۆشدەویست. براکان رقیان لە یوسف دەبێتەوە و بڕیاری کوشتنی دەدەن. راڤبینی برا گەورەیان، ئاگەداریان دەکاتەوە لە کوشتنی. بەڵام، حەزرەتی یوسف لە بیاباندا دەخەنە چاڵێکەوە. ئەوکات بازرگانە مەدیانییەکان کە بە وێدا تێدەپەڕین، حەزرەتی یوسف لە چاڵەکە دەردەهێنن و بە بیست سکەی زیو دەیفرۆشنە ئیسماعیلییەکان کە بەرەو میسر دەچوون. براکان دێنەوە سەر چاڵەکە و چاڵەکە بە بەتاڵی دەبینن. کراسی حەزرەتی یوسف دەدڕێنن و لە خوێنی بزنێک وەردەدەن. کراسی خوێناوی دەدەنە دەستی حەزرەتی یەعقوب. باوک جلەکانی بەری دەدڕێنێت و رۆژانێکی زۆر پرسە دادەنێت.

بەڵام لە میسر، حەزرەتی یوسف وەکو کۆیلەیەک دەفرۆشنە دەوڵەمەندێک بەناوی فوتیفار. حەزرەتی یوسف لەبەر کردەوە راستەکانی، دڵداری لەگەڵ هاوسەری فوتیفار رەتدەکاتەوە ، بەڵام تۆمەتی زینای دەدەنە پاڵ و لە گرتووخانەی دەکەن(دروستبوون ٣٩). حەزرەتی یوسف لە گرتووخانەدا خەونەکانی دوو خزمەتکاری فیرعەون راڤە دەکات. ئەوکات فیرعەونیش بەدەست خەونێکەوە دەناڵێنێت، بەڵام ئارامی بەخشێک نادۆزێتەوە. داوا لە حەزرەتی یوسف دەکەن بۆ راڤەکردنی خەونەکە. ئەویش پێشبینی حەوت ساڵی نیعمەت و خۆشگوزەرانی و لە پاش ئەوانیش حەوت ساڵ برسییەتی و وشکە ساڵی دەکات. فیرعەون لە ئەقڵی زۆری حەزرەتی یوسف سەری سوڕدەمێنێت. کاروباری وڵاتی پێ دەسپێرێت و ئوسناتی کچی فوتی فارعی لێ مارە دەکات (دروستبوون ٤٢).

جارێکی تر چیرۆکەکە باسی ژیانی حەزرەتی یەعقوب و کوڕەکانی دەکات.



وڵاتی کەنعان دووچاری وشکەساڵی دێت. حەزرەتی یەعقوب کوڕەکانی دەنێرێتە میسر بۆ کڕینی ئازووقە، بەڵام بنیامینی بچووکترین برای حەزرەتی یوسف، لەلای خۆی دەهێڵێتەوە. براکانی حەزرەتی یوسف دەچنە میسر و کڕنۆشی بۆ دەبەن، چونکە ئەو ئیتر عەزیزی میسرە، حەزرەتی یوسف براکانی دەناسێتەوە، بەڵام ئەوان ئەو ناناسنەوە. حەزرەتی یوسف براکانی بە سیخوڕی تاوانبار دەکات و یەکێکیان کە شەمعونی ناو بوو لەلای خۆی گل دەداتەوە، تا ئەوانی تر بنیامین بهێنن. حەزرەتی یوسف مەبەستی تۆڵەسەندنەوە نییە. بەڵام، خۆی لەبەرامبەر خودا بە لێپرسراوی کردەوەی براکانی دەزانێت. ئەو کات فەرمان دەدات گونیەی براکانی پڕبکەن لە گەنم و پارەکانیشیان بۆ بگەڕێننەوە. براکان بەترس و لەرزەوە دەگەڕێنەوە لای باوکیان و مەسەلەکەی بۆ دەگێڕنەوە. حەزرەتی یەعقوب لەترسی ئەوەی نەوەک ئازارێک بە بنیامین بگات، ناردنی ئەو بۆ میسر رەتدەکاتەوە. بەڵام وشکەساڵی توندتر دەبێت.

ئەوکات یەهودا داوا لە باوکییان حەزرەتی یەعقوب دەکات رێگە بدات بنیامین لەگەڵ خۆیان ببەنە میسر. براکان لەگەڵ بنیامین دەگەڕێنەوە میسر. حەزرەتی یوسف براکانی بۆ نانخواردن داوەت دەکات، بەڵام ئەم جارەشیان بە بەهانەیەکی تر بنیامین دەخاتە بەندیخانەوە. یەهودا داوا لە حەزرەتی یوسف دەکات لە تاوانی بنیامین خۆشبێت و هەروەها خۆی (یەهودا) لەجیاتی بنیامین بخەنە زیندانەوە. گوتەی یەهودا کار لە حەزرەتی یوسف دەکات و بنیامین و هەموو ئەو کەسانەی کە لە بەندیخانەدان ئازاد دەکات، تاکو خۆی بە براکانی بناسێنێتەوە. سەرەنجام ناسنامەی خۆی بۆ براکانی ئاشکرا دەکات و پێیان دەڵێت کە نەیویستووە تۆڵەیان لێبکاتەوە. مەسەلەکە بە ئاشتبوونەوەی گشتی کۆتایی دێت.

سەرەڕای ئەوە، حەزرەتی یوسف چاو لەتۆڵەسەندنەوە دەپۆشێت و دەرگای لێبووردن دەکاتەوە. هەروەها خۆی لە رق و کینە و ستەم

بەدووردەگرێت و وەڵامی زەبروزەنگی براکانی بە لێبوردەیی دەداتەوە. بەم جۆرە چیرۆکی حەزرەتی یوسف بە ئاشتبوونەوەی براکان نەک تۆڵەسەندنەوە و سزادان کۆتایی دێت.

**لە کۆچی دوایی حەزرەتی یەعقوبەوە تاکۆچی دوایی حەزرەتی یوسف**

کاتێک کە براکانی حەزرەتی یوسف دەبینن باوکیان کۆچی دوایی کردووە، بەیەکتر دەڵێن چی بکەین ئەگەر حەزرەتی یوسف دوژمنایەتیمان بکات و ئەو خراپانەی لەگەڵمان کردن بەرامبەرمان بکاتەوە؟ بۆیە بە حەزرەتی یوسفیان گوت: باوکمان پێش ئەوەی بە یەکجارەکی ماڵئاوایی بکات، وەسیەتی کرد:«بە یوسف بڵێن لە تاوان و هەڵە و ئەو خراپانەی براکانت لەگەڵ تۆ کردیان، ببورە! ئێستا لە تاوانی بەندەکانی خوای باوکت خۆش بە!» حەزرەتی یوسف بە بیستنی قسەی براکانی دەستی کرد بەگریان.»

براکانی حەزرەتی یوسف کەوتنە بەرپێی ئەو و گوتیان «هەموومان بەندەی تۆین!»

بەڵام حەزرەتی یوسف وەڵامی دانەوە : ترس لە دڵ دەرکەن! چۆن هاوەڵ بۆ خوا دروست بکەم؟ ئەو خراپەیەی کە دەتانویست لەگەڵ منی بکەن، بە ویستی خوا بۆ چاکە گۆڕا، بۆ ئەوەی کۆتایی بێت بەوەی کە ئەمڕۆ رویدا و ژیانی کەسانێکی زۆر رزگار ببێت. ئێستا بە هیچ شێوەیەک با ترس نێتە دڵتانەوە. « من پارێزگاری لە ئێوە و هەموو ئەوانەی کە وابەستەن بە ئێوەوە دەکەم»[۳۷] «دڵی ئەوانی دایەوە و بەمیهرەبانی لەگەڵیان دوا».
(دروستبوون: ۵۰)

**٨- حەزرەتی عیسا(د.خ) و ئامۆژگاریی سەرچیا**

ئامۆژگاریی سەرچیا (Sermon sur la Montagne) بە بەشێکی ناودار و



بەرچاوی ئەدەبیاتی ناتوندوتیژی دەژمێردرێت. لە یەکەمین سەدەکانی مێژووی زایینیەوە تاکو ئەمڕۆ، پەیڤەکانی حەزرەتی مەسیح لەسەرچیا بۆ هەموو ئەوکەسانەی لە مێژوودا، باوەڕدار یاخود بێ باوەڕن، داوای ئاشتی و برایەتی و دان بەخۆداگرتن لە خەڵک دەکەن، و رێنماییگەلێکی ئەخلاقی و ئایینیی زۆر دەوڵەمەندیان تێدایە.

بە بڕوای قەشە ئۆگستین، ئامۆژگاریی سەرچیا «perpectvs vitae chirstanea modus» بوو، لەکاتێکدا لۆتەر و هەندێک لە راڤەکانی پرۆتستانت لەو باوەڕەدان کە ئەو ئامانجانەی لە ئامۆژگاریی سەرچیای حەزرەتی مەسیحدا خراونەتەڕوو نایەنەدی. بەڵام بۆ رێبوارێکی رۆحانی وەکو تۆلستۆی، ئەو ئامۆژگارییە بەردی بناغەی ناتوندوتیژیی مەسیحییەتە. لەیادمان نەچێت ئەو زەرووڕەتە ئەخلاقییانەی خۆشەویستی، دادپەروەری و ناتوندوتیژی کە لە ئامۆژگارییەکەدا باسکراون بونیادی فەلسەفی- خواناسیی خەباتی خۆبەدوورگرتن لە توندوتیژیی کەسانێکی وەکو مارتین لۆتەر کینگ، دێزمۆند توتو و ئۆدۆلفۆپیریز سکۆیڤل فەراهەم کردووە، تەنانەت گاندیش کە رەنگە بتوانین بە باوکی هزری ناتوندوتیژی لە سەدەی بیستەمدا ناوبنێین، چەند جارێک ئاماژە بەئامۆژگاریی حەزرەتی مەسیح لە نووسینەکانیدا دەکات.

لەگەڵ ئەوەی کە کەمێک سەیرە، بەڵام لە ئینجیلەکاندا چەمکی ناتوندوتیژی باس نەکراوە. لەجیاتی ئەوە، بەزۆری لە نووسینەکانی حەوارییەکاندا زاراوەگەلێکی وەک ئاشتی و دادپەروەری بەرچاودەکەون. کەواتە، حەزرەتی مەسیح هزری ناتوندوتیژی وەسیەت دەکات بەبێ ئەوەی پەیڤەکەی بەسەر زماندا بێت. لەبارەی کارەکانی حەزرەتی مەسیحیش هەر وایە: ئینجیلەکان روخسارێکی خۆبەدوورگر لە توندوتیژی لەودا دەردەخەن.

بەڵام بەتایبەتی لە راڤەکانی ئامۆژگارییەکەیدا رووبەڕووی هزری ناتوندوتیژی لەلای حەرزەتی مەسیح دەبینەوە. بێگومان لەبەر بارودۆخی

مێژوویییە کە ئامۆژگارییەکە بە ژێدەرێک بۆ خواناسی و ناتوندوتیژی ناسراوە.

لە راستیدا ئەو خوایەی کە حەزرەتی مەسیح بە ئێمەی دەناسێنێت، خوایەکی بێ توندوتیژییە، کەواتە خودی حەزرەتی مەسیح لەبەرگی پێغەمبەرێکی خۆبەدوورگر لە توندوتیژی، نیشاندەری ئەو خوایەیە. هەر لە یەکەم رۆژی پەیامەکەیەوە وەک پێغەمبەر، دژی زەبروزەنگ و ستەم دەجەنگێت. لە سەرەتای ئینجیلی قەشە مەرقۆسدا، حەزرەتی مەسیح داوا لەخەڵکان دەکات تۆبە بکەن و ناتوندوتیژیی خوا پەسەند بکەن «کاتەکە هاتووە و پادشاهێتی خودا نزیک بووەتەوە، تۆبە بکەن و باوەڕ بهێنن بەم مزگێنییە.» (مەرقۆس ١: ١٥)

لە ئینجیلی قەشە لۆقادا هاتووە، حەزرەتی مەسیح مژدەی فەرمانڕەوایی خوا رادەگەیەنێت کە لەگەڵ میهرەبانی و دلۆڤانیی دەردەکەوێت. «پێویستە مژدەی فەرمانڕەوایی خوا بە شارەکانی تریش رابگەیەنم چونکە بۆ ئەو مەبەستە نێردراوم.» (لۆقا٤: ٤٣) لە کاتێکدا کە لە ئینجیلی مەتتادا، مەسیح وەک مامۆستای ئەقڵ و یاسای ئەخلاقی ناسراوە. مەتتای قەدیسیش بە یاسادانەرێک کە بۆ دانانی هەندێک یاسا و گۆڕینی یاساکانی تر هاتووە ناوی دەبات. هەر لەو رووەوە، لە ئامۆژگاریی سەرچیادا لەیەک کاتدا جێگەی شادمانی و ئامۆژگاری، بەتایبەت دادگەری و خۆشویستنی دوژمنان بەیەکەوە کۆکراونەتەوە. بۆ نموونە لەو دەستەواژەگەلەی کە هێنامانەوە وەک هەواڵی خۆش مژدەی شادمانییەکان دراون. مەسیح دەڵێت خۆزگە بە حاڵی هەموو ئومێدەوار و برسی و تینوویەکی دادپەروەری. مەسیح خۆشی و شادی بە هەژار و ئازار چەشتووەکان دەبەخشێت. چونکە ئەوان ستەم لە کەس ناکەن، داوامان لێدەکات بۆ هەژاری و لێبوردن و میهرەبانی، و پێمان دەڵێت برسی و تینووی دادپەروەری بین. بەڵام دادپەروەرییەکی نوێ تەواوکەری رێگای



ناتوندوتیژیی مەسیحە ئەم رێگایە شەش لادان (تجاوز) دەگرێتەوە کە زۆربەی خەڵک بە ئەنتی تیزی دادەنێن. مەسیح دژایەتی یاسای کۆنی یەهودییەتی کردووە، و راڤەکانی خۆی بەگوێرەی یاسای خوایی دەخاتەڕوو. بەم شێوەیە ئەو یاسا رەتناکاتەوە، بەڵکو یاسای رێکخستووە و بە کەماڵی گەیاندووە، چونکە هەم خودی حەزرەتی مەسیح و هەم گوتارەکەی تەواوکەری یاسا و پێغەمبەرانی پێش ئەون. ئەم بەشەی ئینجلی مەتتا (٥: ٤١-٤٨) لە پێشەکییەک و شەش لادان پێکهاتووە. پێشەکی (٥: ١٧-٢٠) لە چوار ئامۆژگاری پێک دێت. شەش لادانەکە بریتین لە: کوشتن، زینا، لێکجیابوونەوە، سوێند، یاسا، قەساس، خۆشەویستیی دوژمنان. یاسا لە چاخی کۆندا پاڵپشتی لەکەمینە دەکات، بەڵام حەزرەتی مەسیح فەرمان و ئەرکەکان زیاد دەکات، سنووردارێتی لە یاسادا هەڵدەگرێت و ئەحکامەکانی چاخی کۆن بەرز دەکاتەوە.

بەم شێوەیە ناتوندوتیژیی بنەڕەتیی حەزرەتی مەسیح تەنیا کار ناکاتە سەر مەسیحییەکان بەڵکو کار دەکاتە سەر هەموو مرۆڤەکان. بەم شێوەیە پێویستە باوەڕدار بە رادەی کەماڵ بگات: «کەواتە بە کەماڵ بگە، چونکە خوای تۆ کاملە.»

دەروەستەیی حەزرەتی مەسیح بە ناتوندوتیژییەوە لە چوارچێوەی سادەی فێربوونی بنەما ئەخلاقییەکان تێدەپەڕێت. زەرورەتێکی ئەخلاقییە کە لە ویستی مەسیحیدا دەردەکەوێت و داوا لە پەیڕەوەکانی دەکات بچنە ریزی ئەوانەی خوا دەپەرستن. کەواتە هەموو قسەکانی حەزرەتی مەسیح لە ئامۆژگاریی سەرچیادا لە ئەرکێکی باڵا، لە ئاییینێکی زێڕیندا کورت دەبنەوە: «چۆن دەتانەوێ خەڵکی هەڵسوکەوتتان لەگەڵ بکەن، بەهەمان شێوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەن؛ ئا ئەمەیە پوختەی شەریعەت و فێرکردنی پێغەمبەران.» (مەتتا ٧:١٢) لێرەدا حەزرەتی مەسیح پەیامی ناتوندوتیژیی بە زەرورەتێکی بنچینەیی دادەنێت کە هەمان بایەخدانە بە

ئەوانی تر. کەواتە حەزرەتی مەسیح خۆی لە رووبەڕووبوونەوەی توندوتیژانە بەدووردەگرێت و فێرە خۆشەویستی دوژمنمان دەکات. حەزرەتی عیسای مەسیح داوا لە هەموو خەڵک دەکات بەشداری لە بزاڤی گەورەی خۆشەویستیدا بکەن کە خوا خۆی دامەزرێنەر و حەزرەتی مەسیحیش پەیامهێنەرە هەڵبژێردراوەکەیەتی.

بەم شێوەیە خۆشەویستی خوایی لە کار و بزاڤە مەسیحییەکاندا شێوەیەکی مرۆیی بە خۆیەوە دەگرێت و دەبێتە بنەمای فەلسەفی-خواناسیی (تیۆلۆجی) تێزێکی خۆبەدوورگیرانە لە توندوتیژی بۆ گۆڕینی جیهان. دواجار دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە سەرەڕای ئەوەی لە ئینجیلەکاندا تیۆرێکی روون لەمەڕ ناتوندوتیژی نابینرێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین عیسای مەسیح بەو مرۆڤ و پێغەمبەرە دابنێین کە هەمیشە لە پێناو ناتوندوتیژی هەنگاوی ناوە و ئاوەها ژیاوە. لەم رووەوەیە کە بە درێژایی سەدەکان، ئەو کەسانەی لە بەرامبەر ستەمدا رێگەی ناتوندوتیژییان هەڵبژاردووە پشتیوانیان لە ئامۆژگاریی سەرچیا کردووە.

## ئامۆژگاریی سەرچیا

حەزرەتی عیسا بۆ دیتنی خەڵکی بەسەرچیادا هەڵگەڕا. پاشان دانیشت و دەروێشەکانی لێی خڕبوونەوە. عیسا دەستی بە قسە کرد و ئەوانی بەم شێوەیە فێرکرد:[٣٨]

خۆزگە دەخوازرێ بەوانەی هەژارن لە رۆح
چونکە پاشایەتی ئاسمان بۆ ئەوانە.
خۆزگە دەخوازرێ بە لێو بەبارەکان





چونکە دڵنەوایی دەکرێن.
خۆزگە دەخوازرێ بە دڵنەرمەکان
چونکە زەوی بۆ ئەوان بە میرات دەمێنێتەوە.
خۆزگە دەخوازرێ بە برسی و تینووەکان بۆ راستی و دروستی
چونکە تێر دەبن.
خۆزگە دەخوازرێ بە دڵ پڕ لە بەزەییەکان
چونکە بەر بەزەیی دەکەون.
خۆزگە دەخوازرێ بە دڵپاکەکان
چونکە خودا دەبینن.
خۆزگە دەخوازرێ بە ئاشتیخوازان
چونکە بە رۆڵەی خودا ناو دەبرێن.
خۆزگە دەخوازرێ بە چەوسێنراوان لە پێناو راستی و دروستی
چونکە پاشایەتی ئاسمان بۆ ئەوانە.

خۆزگە دەخوازرێ پێتان، کاتێ خەڵکی جنێوتان پێدەدەن و دەتان چەوسێننەوە، لە پێناوی من قسەی خراپتان دەدەنە پاڵ. دڵخۆش و شادومان بن، چونکە پاداشتتان مەزنە لە ئاسمان، ئاواش پێغەمبەرانیان پێش ئێوە چەوساندۆتەوە.

( ئینجیلی مەتتا ٥: ١-١٢)

«بیستووتانە لە کۆندا بە خەڵکی وتراوە: خەڵکی مەکوژن، ئەوەی بکوژێت شایانی حوکم بەسەردانە. بەڵام من پێتان دەڵێم: هەر کەسێ بە نارەوا لە براکەی توورە بێت شایانی حوکم بەسەردانە.»

( ئینجیلی مەتتا ٥: ٢١-٢٢)

«بیستووتانە چاو بە چاو و ددان بە ددان. بەڵام من پێتان دەڵێم بەربەرەکانی خراپە بە خراپە مەکەن. ئەوەی کێشای بە روومەتی راستت،

ئەوی کەشی بۆ راگرە. ئەوەی ویستی کراسەکەت ببات، چاکەتەکەشی بدەرێ، ئەوەی ناچاری کردی یەک میل لەگەڵی برۆیت، دوو میل لەگەڵی برۆ. ئەوەی داوای شتێکی لێکردیت، بیدەرێ، ئەوەی قەرزت لێدەکات، مەیگێرنەوە.»

(ئینجیلی مەتتا ٥: ٣٨-٤٥)

«بیستوتانە ووتراوە: ئەوەی لێت نزیکە خۆشت بوێ و ئەوەی دوژمنە رقت لێی بێت. بەڵام من پێتان دەڵێم: دوژمنەکانتان خۆش بوێ و نوێژ بکەن بۆ ئەوانەی دەتان چەوسێننەوە، بەمە دەبنە رۆڵەی ئەو باوکەتان کە لە ئاسمانە...»

(ئینجیل مەتتا ٥: ٤٣-٤٥)

«خەڵکی تاوانبار مەکەن تا تاوانبار نەکرێن، چونکە بەو شێوەیەی خەڵکی تاوانبار دەکەن ئێوەش تاوانبار دەکرێن، بەو پێوانەی بۆ خەڵکی دەپێون، بۆتان دەپێونەوە. بۆچی سەرنج لە پووشی ناو چاوی براکەت دەدەیت، بەڵام ئاگات لە تەختەدارەکەی ناو چاوی خۆت نییە؟ یان چۆن بە براکەت دەڵێیت ڕێم بدە با ئەو پووشە لە چاوت دەربهێنم؛ لە کاتێکدا تەختەدارێک لە چاوی خۆت دایە. ئەی دوو روو، یەکەم جار تەختەدارەکەی ناو چاوت دەربهێنە تا باش ببینیت ئەوسا پووشی ناو چاوی براکەت دەربهێنە.»

(ئینجیلی مەتتا ٧: ١- ٥)

**٩- فرانسیسی ئاسیزی: دۆزینەوەی هەژاریی ئینجیلیانە**

فرانسیسی ئاسیزی (Saint Fran ois d Assise) ئەو قەدیسەیە کە بۆ



ڕێنماییەکانی مەسیح دەگەڕێتەوە. پەیڕەوی ئینجیلی هەژاری و برایەتییە. هەروەها زیندووکەرەوەی ئینجیلە. قەشە فرانسیس لە میانەی لێکۆڵینەوەیەکی نوێی ئینجیلدا، بەشێوەیەکی تازە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و جیهان لێکدەداتەوە. ئەو شتەی کە رەهەندێکی مەعنەویی راستەقینە بە تاقیکردنەوەی ئینجیلی قەشە فرانسیس دەدات، هەمان رووبەڕووبوونەوەی نێوان پەیامی خۆبەدوورگیرانە لە توندوتیژیی مەسیح و مێژووی سەدەکانی ناڤینە لە ئەوروپا. فرانسیسی ئاسیزی لە جەرگەی کۆمەڵگای ئایینیی ئیتاڵیای سەدەی دوازدە و لە نێو هەموو عاریفە مەسیحیەکاندا، روخسارێکی نوێ لە خوا، زۆر جیاواز لەوەی کە لە لایەن کەنیسە و کەسایەتییەکانی سەردەمەکەی پێشانی خەڵک دەدرا، دەدۆزێتەوە.

فرانچیسکۆ برنادۆنا (Francesco Bernadona) لە ساڵی ١١٨٢ز لە خێزانێکی خۆشگوزەراندا لە دایک بوو. باوکی بازرگان بوو و بە زۆری لەبەر کار و کاسبی دەچووە ئەو دیو چیاکانی ئالپ. دەیویست منداڵێکی وەکو خۆی ببێت. فرانسیس لەبەر ئەوەی خۆشەویست و خوێن گەرم بوو، هەر زوو سەرنجی لاوە خۆشگوزەرانەکانی شارۆچکەی ئاسیزی راکێشا، و زۆربەی کاتەکانی خۆی بە جەژن و شادی لەگەڵ ئەوان دا بەسەر دەبرد. ئەو کە شاعیری ئایینی بوو دەیویست ببێتە شاسوار و بچێتە ریزی هێزە سەربازییەکانی پاپا و لە باشووری ئیتاڵیا لەگەڵ سوپای ئیمپراتۆری بجەنگێت. بەڵام لە نیوەی ڕێگای سپۆلیت (Spolite) راوەستا، چونکە دەنگێکی دەروونی داوای لێدەکرد بۆ شارە زێدەکەی بگەڕێتەوە. لە گەڕانەوەدا، وازی لە برادەرە کۆنەکانی هێنا و بێدەنگی و گۆشەگیری بۆ دوعاکردن هەڵبژارد. فرانسیس لەو هەموو خۆشیانەی کە حەزی لێدەکردن دوورکەوتەوە و بڕیاریدا بۆ سەردانی مەزاری حەواریەکان بچێتە رۆما و لەگەڵ خوای خۆی رووبەڕوو ببێتەوە.

کاتێ گەیشتە رۆما، لەگەڵ سواڵکەرەکانی گۆڕەپانی قەشە پوترۆسدا





تێکەڵاو بوو. چووە لای بێچارە و هەژارکان و لە جاران زیاتر بایەخی بە بێنەوایان دا. لە گەڕانەوەدا بۆ ماڵەوە لە ئاسیز، چەند تۆپە قوماشێکی سووری لە دوکانی باوکی فرۆشتن تاکو گوژمەی چاکردنەوەی میحرابی کەنیسەی قەشە دامیانۆ (Saint Damiano) دابین بکات. پێترۆ برنادۆنا (Pietro Bernadona)ی باوکی لە شێوەی نوێی ژیانی کوڕەکەی توڕەبوو، کوڕەکەی هێنایە لای ئەسقەفی ئاسیز بۆ دادگاییکردنی. کاتێک بڕیاردرا پارەکانی باوکی بگەڕێنێتەوە، فڕانسیس جلەکانی داکەندن و فڕێی دانە پێش باوکی و هاواری کرد: «هەمووتان گوێ لە من بگرن و بزانن! تا ئێستا پیترۆ برنادۆم بە باوکی خۆم دادەنا. بەڵام دەتوانم ئێستا بڵێم باوکم لە ئاسمانەکانە.»

بەم شێوەیە فڕانسیس پەیوەندی لەگەڵ رابردوو پچڕاند تا ژیانێکی نوێی مەعنەوی دەست پێبکات. لە نزیک میحرابی کەنیسەی قەشە دامیانۆدا نیشتەجێ بوو. دوعای دەکرد و بەننایی کرد بەپیشە. جلی زاهیدانەی پۆشی و گۆچان بە دەست لە کەنیسەیەکەوە دەچووە کەنیسەیەکی تر تاکو چاکیان بکاتەوە. رۆژێکیان لە کەنیسەی مەریەمی پیرۆز خەریکی پەرستن بوو -ئەو کەنیسەیەی کە کاری چاکردنەوەی بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت- لە زمانی قەشەی پیری کەنیسەکە گوێ بیستی ئەم گوتانەی حەزرەتی مەسیح بوو: «کەواتە بڕۆ و ئامۆژگاری خەڵکان بکە و بڵێ: فەرمانڕەوایی ئاسمانەکان نزیکە. لە شاڵەکانتاندا نە زێڕ و، نەزیو و نەدراوتان پێنەبێت و نەخواردنێکتان بۆ رێگا پێبێت، نە جل، نەپێڵاو، نەگۆچان،...» فڕانسیس بە بیستنی ئەم وتانە بووڕایەوە. پێڵاو و گۆچانەکەی فڕێدان، وەکو دەروێشەکانی حەزرەتی عیسا تەنیا بە پارچەیەکی قوماش کە لەشی داپۆشیبوو بۆ ئامۆژگاری کردن ئەم شوێن و ئەو شوێنی دەکرد. لەو رۆژە بە دواوە، بە بەردەوامی فڕانسیس رێگای دەبڕی تا داوای ئاشتی و خۆشەویستی لە خەڵکی بکات. هەر زوو چەند



کەسێک لە کاسبکارە بە تواناکانی شاری ئاسیز پەیوەندیان پێوەکرد. بەم شێوەیە کۆمەڵەی برایەتی فڕانسیسکن دروست بوو[٣٩].

لە ساڵی ١٢٠٩ فڕانسیس لەگەڵ برا هاورێیازەکانی، بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانیی پاپا بەرەو رۆما بەڕێ کەوت و بۆ سێیەمین جار پاپا ئینۆکنتیۆس (Pape Innocent III)ی بینی. پاپا دوای کەمێک بیرکردنەوە رازیبوونی زارەکی خۆی راگەیاند و کۆمەڵەی تۆبەکارانی ئاسیز بە شێوەی گرووپێکی ئایینی ناسرا و بووە خاوەنی شوێن کەوتووگەلێکی نوێ، کە لیۆن (Leon)، جەنەڤیڤە (Genevieve) و ماسەیۆ (Masseo) بەناوبانگترینیان بوون. لەگەڵ ئەوەی کە فڕانسیس و براکانی رایانگەیاند کە گرووپەکەیان شێوازێکی نوێی ژیانە بە پێی رێنماییەکانی ئینجیل و لەسەر خاکەڕایی، هەژاری و برایەتی راوەستاوە. دەسەڵاتی کەنیسەیان پەسەند کرد و بە هیچ شێوەیەک حوکمیان لە بارەی گەندەڵی و پلەوپایەکان نەدا. فڕانسیس لە وەسیەتنامەکەیدا دەنووسێت: «خوا لە کەنیسەدا وەها باوەڕی پێ بەخشیوم کە ئاوەها بە سادەیی دەیپەرستم و دەڵێم عیسای مەسیح ئەی پیرۆزترین، لێرەو لە هەموو کەنیسەکانتدا و لەسەرتاسەری جیهاندا ستایش و سوپاست دەکەم، چونکە بە خامە پیرۆزەکەت جیهانت رزگار کرد.» «پەروەردگار باوەڕێکی وەهای بە من و ئەو قەشانەی کە وەکو کەنیسەی پیرۆزی رۆما دەژین بەخشیوە. ئەگەر هەر ئەو ئازارمان بدات، دیسان پەنا بۆ ئەو دەبەین. و کاتێک کە بە زانایی ببمە سولەیمان، ئەگەر هەندێک قەشەی بێ نەوا ببینم کە ژیانی دنیاییان گرتۆتە بەر، بەپێچەوانەی خواستی ئەوان، نامەوێ ئامۆژگاری لە سنووری قەڵەمڕەوەکەیاندا بکەم. پێم خۆشە ئەوان و قەشەکانی تر وەک مامۆستای خۆم خۆش بوێن، بە گەورەیان بزانم و رەچاویان بکەم.»[٤٠]

کەواتە فڕانسیس خۆشەویستی بە پرەنسیپی بنچینەیی ژیانی مەعنەوی دەزانێت. کەواتە دەتوانین بڵێین خۆشەویستی بنچینەی مانای

فڕانسیسکنە و هەر کارێک کە لە لایەن فڕانسیس و گرووپەکەی فۆرمالیزە ببێت پێویستە لەم ڕەهەندەدا لێک بدرێتەوە. ئەم خوا خۆشەویستنەی فڕانسیس تێکەڵ بە ئەوینی مرۆڤەکان دەبێت.

بەشی یازدەیەم لە یەکەمین ڕێبازی دادوەرییەکانی ئەو تایبەت بووە بەم بابەتەوە:

«پێویستە یەکتریان خۆش بوێت... و کردەوەکانیان نیشاندەری ئەو چاکەیە بێت کە پێویستە لە نێوانیاندا بەرقەرار بێت... و خاکەڕابن، پڕ لە میهرەبانی لە بەرامبەر ئەوانی تر.»[٤١]

ئەم ئەوینە لەخۆوەیی و بەپەرۆشەی فڕانسیس کە هاوکاتە لەگەڵ خاکەڕایی بەشێوەیەکی کەمتر لە هەموو فەڕانسیسیکنەکاندا فۆرمێکی سیمبۆلی وەردەگرێت:

«هێز و دەسەڵاتخوازی لە نێوان برایەکاندا نەبێت... بەڵام ئەوەی کە دەیەوێت لە نێوانیاندا بە گەورەترینیان دەرکەوێت، با وەک بچووکترینیان بێت.»[٤٢]

لە لای فڕانسیس ئەوینی مەلەکوتی و گیانی هەژاری لەگەڵ شادییەکی گەردوونیدا بە کەماڵ دەگەن. فڕانسیس لە میانەی سروودەکانی دوعادا ئەم شادییە گەردوونییە لە ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ سروشتدا دەردەبڕێت. ستایشی گوڵ و ئەستێرەکان دەکات. لەگەڵ باڵداران دەچریکێنێت و سەبارەت بە بچووکترین گیانەوەران ئەوینێکی گەورە لە خۆی پیشان دەدات. سێلانۆ (celano) یەکەمین ژیاننامەنووسی فڕانسیس، لەمەڕ ئەو خۆشەویستییە دەڵێت: «بە تایبەتی ئەو کاتەی تەماشای خۆری دەکرد، لە مانگی دەڕوانی و سەیری ئەستێرەکان و گەردوونی دەکرد شادییەک کە وەسف ناکرێت هەموو بوونی ئەوی دادەگرت... کرمی زۆر خۆشدەویست، چونکە خوێندبوویەوە ڕزگارکەر گوتویەتی: من کرمێکم نەک مرۆڤێک. بۆیە کرمەکانی لەسەر ڕێگا هەڵدەگرتن و دەیخستنە کەنارەوە، لە ترسی



ئەوەی نەوەک لە ژێر پێی ڕێبواراندا پان ببنەوە...»[٤٣]

پەیامی مەعنەویی فڕانسیس بەرزترە لە ڕێڕەوێکی زاهیدانە. تاقیکردنەوەی ناتوندوتیژی لە شێوەی یەکێتی لەگەڵ جیهاندا دەچەسپێت. فڕانسیس لە قووڵایی ئەم یەکێتییەدا، ڕێگای ئەوینی خوایی و شادمانیی ئینجیلی ڕزگاری دەدۆزێتەوە و دەیانگۆڕێت بۆ ئاوازی سروودی ئایینی. بە پێی دەستەواژەیەکی پۆڵ ریکۆر، فڕانسیسی ئاسیزی لە هەوڵی ئەوەدایە هەموو دوژمنایەتییەک بگۆڕێت بۆ کێشمەکێشێکی برایانە لە نێو یەکەیەکی مەخلوقدا.»[٤٤]

بەم شێوەیە بە بۆچوونی فڕانسیسی قەدیس، ژیان و ئامۆژگاریی ئاشتی و ئارامی یەک شتن. دەتوانین ئەم شەیداییەی بۆ ئاشتی لە «سروودی ئافریدەکانی» ئەودا ببینین. هەروەها ئەم شەیداییە لە دوعای بەناوبانگی قەشە فڕانسیسدا کە کەسانێکی وەک دایکە تێریزا چەندین جار گوتوویانەتەوە، دەردەکەوێت.

قەشە فڕانسیسی ئاسیزی، پێش مردنی لە سێی ئۆکتۆبەری ١٢٢٦، لە تەمەنی ٤٤ ساڵیدا بواری بۆ ڕەخسا کۆتایترین بەندی «سروودی خۆر» بچڕێت: «سوپاس بۆ تۆ خوایە کە خوشکمان مردنی جەستەی داهێنا کە هیچ بوونەوەرێک لێی ڕزگار نابێت...»

لاشەی بەگوڵ داپۆشراوی قەشە فڕانسیس، ڕۆژێک دوای مردنی گێڕدرایەوە بۆ ئاسیز و لە کەنیسەی جۆرجی قەدیسدا بە خاک سپێردرا. بەم شێوەیە ئەم هەنگاوەی قەشە فڕانسیس وەک سەرسوڕهێنەرترین ڕووداوی مێژوویی جیهانی مەسیحییەت لە سەدەکانی ناڤیندا بەری گرت. قەشە فڕانسیس وەکو کەسێک کە زیاتر لە هەمووان لە ئامانجی مەسیحییەتی یەکەم و ڕێنماییەکانی حەزرەتی عیسای مەسیح لەمەڕ ناتوندوتیژی و خۆشەویستی نزیک بووەوە، چووە نێو ئەفسانەوە.

**دوعای قەشە فرانسیس**

خوایە بمکە بە ئامرازی ئاشتی، کە
بۆ ئەو شوێنەی کە رقی لێیە، خۆشەویستی بەرم
بۆ ئەو شوێنەی کە خراپەی لێیە، لێبوردن بەرم
بۆ ئەو شوێنەی کە دووڕوویی لێیە، تێگەیشتن بەرم
بۆ ئەو شوێنەی کە گومڕایی لێیە، راستی بەرم
بۆ ئەو شوێنەی کە گومانی لێیە، باوەڕ بەرم
بۆ ئەو شوێنەی کە بێ ئومێدی لێیە، هیوا بەرم
بۆ ئەو شوێنەی کە تاریکیی لێیە، رووناکی بەرم
بۆ ئەو شوێنەی کە غەمی، شادومانی بەرم
خوایە، وا بکە کە
زیاتر لەوەی دڵم بدرێتەوە، دڵبدەمەوە
زیاتر لەوەی درکم بکەن، درک بکەم
زیاتر لەوەی خۆشیان بوێم، خۆشم بوێن
چونکە بە خۆ لەبیربردنەوە، دەتوانین بدۆزینەوە
بە بەخشین دەتوانین دەبەخشرێین
بە مردن، دەتوانین چاو بە ژیانی نەمر هەڵبێنین

**سروودی ئافەریدەکان**

ئەی باشترین، بە توانای رەها، خوای باش
ستایش، گەورەیی، شانازی و میهرەبانی گشتیان هی تۆن؛
تەنیا ئەی باشترین، تۆ شایستەی ستایشی
و هیچ مرۆڤێک شایستە نییە ناوی تۆ بهێنێت
سوپاس بۆ تۆ، پەروەردگارم، و هەموو ئافەریدەکانت



بە تایبەتی پایەبەرز خۆری برا،
کە تیشک بڵاودەکاتەوە و بەوەوە رووناکیمان پێدەبەخشێت؛
و جوان و تیشک هاوێژە، زۆر بەشکۆیە؛
ئەی باشترین، خۆر بەڵگەیەکی تۆیە.
سوپاس بۆ تۆ، پەروەردگارم، کە مانگی خوشک و ئەستێرەکانت دروستکردن و لە ئاسمانەکاندا، رووناک، بەنرخ و جوانت کردن
سوپاس بۆ تۆ، ئەی پەروەردگارم، کە برای با
هەروەها هەواو، هەور و ئاسمانی گەش و کاتت داهێنان
کە بە ئەوان یارمەتی ئافەریدەکانت دەدەی
سوپاس بۆ تۆ، ئەی پەروەردگارم، کە ئاگری برات داهێنا،
کە شەوی پێ رووناک دەکەیتەوە و
جوان و شادومان و جێگیر و بە توانایە.
سوپاس بۆتۆ، ئەی پەروەردگارم، کە زەوی خوشکی دایکیمانت داهێنا
کە دەمانگرێتە خۆی و دەمانبات
و میوە جۆراوجۆرەکان لەگەڵ گوڵە رەنگاورەنگ و سەوزەکان بەرهەم دەهێنێت
سوپاس بۆ تۆ، ئەی پەروەردگارم، لە پێناو ئەوانەی کە لەبەر ئەوینی تۆ لێیان دەبەخشرێن و ستەم و زەحمەت دەکێشن
خۆزگە بە حاڵی ئەوانەی کە بۆ ئاشتی تێدەکۆشن.
چونکە تۆ ئەی باشترین، پاداشتیان دەدەیەوە
سوپاس بۆ تۆ ئەی پەروەردگارم، کە خوشکمان مردنی جەستەییت داهێنا،
کە هیچ بوونەوەرێکی لێی رزگار نابێت؛
دوور بین لە حاڵی ئەوانەی کە بە گوناهباری دەمرن؛
بەڵام خۆزگە بە حاڵی ئەوانەی کە بەرگی کردەوە دەکەنە بەر ویستە

پیرۆزەکانت
چونکە پارێزراون لە ئازاری مەرگی دووەم.
سوپاسی پەروەردگاری من بکەن و رەحمەتی بۆ بنێرن و زۆر بە خاکەڕایی سوپاس و خزمەتی بکەن.

### ١٠- سەعدی: مرۆڤگەرایی ئیسلامی

ئەمڕۆ کۆمەڵێک خەڵکی ئەم سەردەمە، ئیسلام بە ئایینی ناتوندوتیژی و دانبەخۆداگرتن لە قەڵەم نادەن، بەڵام هەڵەیە ئەگەر حوکم بەسەر تاقینەکردنەوەی خۆ بە دوورگرتن لە توندوتیژی لە ئایینی ئیسلامدا بدەین، بەبێ ئەوەی باس لە نەریتەکانی عاریفە عەرەب و ئێرانییەکان بکەین، ئەو نەریتانەی کە لە جیهانی ئیسلامیدا کاریگەرییەکی پۆزەتیڤیان لەسەر بزاڤە خۆ بەدوورگرەکان لە توندوتیژی هەبووە:
زیاتر لە تەمەنێک و تەنانەت زیاتر لە کتێبێکیش پێویستە تاکو بتوانرین باس لەم نەریتانە بکەین. ئەمە خۆی بوارێکە بۆ ئەوەی سەعدی، یەکێک لە کەسایەتییە گەورەکانی عیرفانی ئێرانی بخەینەڕوو تا نیشانەییەک بێت لەسەر خولیا مرۆڤگەرایەکانی ئیسلام. بە گۆتەی و. ئا. کلارتۆن (W.A.Clarton): «بێگومان سەعدی بە بەتواناترین بلیمەتی هەموو چاخەکان لە قەڵەم دەدرێت.»
شێخ موسلیحەددین یاخود موشریفەددین سەعدی لە دەوروبەری ساڵی ٦٠٠ی کۆچی لە شیراز لە دایک بووە. باوکی لە گەورەپیاوانی دەرباری موزەفەرەددین توکلەی کوڕی ئەتابەکی زەنگی، سێیەمین ئەتابەکی ویلایەتی فارس بووە سەعدی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی جەنگیزخاندا لە ئاسیا و هەروەها لە سەردەمی ئیلیخانییەکان لە ئێراندا دەژیا. خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی نیزامییەی بەغدا تەواو کرد کە وەزیری ئەعزەم، خواجە نیزامولمەلیک دایمەزراندبوو.



لە بەغدا لەگەڵ ئەبولفەرەجی ئیبن جوزی و شێخی گەورە شەهابەددین عومەر سێهرەوەردی ئاشنا بوو. هەروەها لەو سەردەمەدا بوو کە لە قوتابخانەی نەقشبەندییەدا ئەتەسەوفی ناسی بە توندی کەوتە ژێر کاریگەریی گوتەکانی نەجمەددین کوبرای نەقشبەندی. سەعدی گەڕوکێکی بێ وێنە بوو؛ چین، هیندستان، تورکستان و مەراکشی بینی.
لە بەرهەمە گەورەکەیدا بەناوی گوڵستان، باسی زۆربەی ئەم سەفەرانەی کردووە. گوڵستان لە ساڵی ٦٥٦کۆچی، دوو ساڵ پاش گەڕانەوەی سەعدی بۆ شیراز نووسراوە. هەروەها لە هەمان کاتدا بەرهەمە پەخشانە شعرییەکەی بەناوی بوستانی نووسی. گوڵستان شیعر و پەخشانە کە لە بنچینەدا ئیلهامی لە هزرە سۆفییەکان وەرگرتووە. بەرهەمێکی فێرکەرانەیە لە شێوەی نامەیەکی ئەخلاقی (لە شێوەی ئەخلاقی ناسری، بەرهەمی خواجە نەسیرەددینی تووسی) کە شێوازی ژیان دەخاتەڕوو. ئەم بەرهەمە لە دیباجەیەک، پاشەکییەک و هەشت بابەت پێکدێت. ناونیشانی دوو بەشی یەکەم کە لە شەش بەشەکەی تر درێژترن، بەم شێوەیەی خوارەوەیە: لە بارەی ژیاننامەی پاشایەکان و لەبارەی ئەخلاقی دەروێشاندا. شەش بابەتەکەی تر بریتین لە: لەبارەی فەزیلەتی قەناعەتدا، قازانجەکانی بێدەنگی، لەبارەی جوانی و خۆشەویستی، لە بارەیلاوازی و پیریدا، لەبارەی کاریگەریی پەروەردە، لەبارەی ئادابەکانی قسەکردندا.
شێوازی روون و رەوان، گیانی وردبینانە و تەنز ئامێز و نووسینی فێرکەرانەی گوڵستان رۆڵێکی شایستەیان هەیە لە بەناوبانگ کردنی سەعدیدا. بەم شێوەیە گوڵستان (زیاتر لە بوستان) ئەو بەرهەمەیە کە ماوەی حەوت سەد ساڵە لە جیهاندا بە بەردەوامی خوێنراوەتەوە. زۆربەی نووسەرانی سەدەکانی هەژدە و نۆزدە چەندین جار باسیان لێوە کردووە، نووسەرانی وەکو گۆتە، هاینە، رێنان، هۆگۆ، پۆشکین و سەرادڤین ئارنۆڵد.
ئەو ئەمریکیانەی پەیڕەوی ترانساندانتالیزمن (فەلسەفەی باڵاخوازی)

وەک ئێمەرسۆن و تورو ستایشی گوڵستانیان کردووە و زۆرجار لەبەرهەمەکانیاندا ناویان بردووە. ئێمەرسۆن لە یادداشتەکانیدا لەمەڕ سەعدی دەنووسێت: «مرۆڤایەتی سەعدیی خۆش دەوێت...(چونکە) سەعدی شاعیری دۆستی، خۆشەویستی، پاڵەوانی برادەرایەتی، وەفاداری، چاکە، دەروون پاکی و ویستی خواییە.»[٤٥]

لەروانگەی سەعدییەوە ئەوین سروشتێکی عیرفانیی هەیە. ئامانجەکەی یەکێتییە لەگەڵ مەعشوق کە خوایە. بەم شێوەیە کاتێک سەعدی باس لە مەی و مەیخانە و ژیان دەکات، پێویستە ئەوە بە تامەزرۆیی و ئیخلاسی عارف لە بانگکردنی خوا راڤە بکەین. رەنگە هەر لەبەر ئەوە بێت لە گوڵستاندا سەعدی رەخنە لە زوهد فرۆشیی دەروێشە درۆزنەکان دەگرێت. لەچیرۆکی شەشەمی بەندی دووەمی گوڵستاندا دەڵێت:

«ئەی هونەردانەر لەسەر بەری دەست     لەبن باخەڵاعەیبت داپۆشی
چۆن بەپارەی قەڵپ ئەتوانی سەرکەش     چشی بکرە وە یا بفرۆشی»[٤٦]

هەروەها سەعدی رەخنە لەخۆبایی بوون و زەبروزەنگ دەگرێت، بۆیە بە شاعیری لێبوردەیی و مرۆڤدۆستی لە قەڵەم دەدرێت. بەشی یەکەمی گوڵستان سەرتاپای پڕە لەو ئامۆژگاریانەی کە بانگی پادشاکان دەکات تاکو واز لە زەبروزەنگ و ستەم بهێنن. بۆ نموونە لە چیرۆکی شەشەمی بەشی یەکەمدا دەڵێت:

«شەهی زۆرِ و ستەم بێ خووی بەرامبەر ژێر دەستانی
لە جەنگا دۆستانی لێ ئەبێتە دوژمنی گیانی»

هەروەها لەچیرۆکی یازدەهەمی بەشی یەکەمدا هاتووە:

«ئەی زەبردەستی ژێردەس بەئازار     تاکەی بمێنێ وا گەرم بازار»





سەعدی داوا لە مرۆڤەکان دەکات بە بەزینی دوژمنەکانیان شاد نەبن، چونکە ژیان پێشکەشکراوێکی هەتاهەتایی نییە:

«ئەگەر بمرێت دوژمن جێگەی شادمانی نییە
کە ژیانی ئێمەش جاویدانی نییە»

بەمانایەکی تر، سەعدی لەو بڕوایە دایە کەپێویستە ئاشت بین لەگەڵ دوژمنان، چونکە مرۆڤەکان «لە یەک گەوهەر دروست کراون».

گوڵستان بە دووماهییەکی کورت کۆتایی دێت تیایدا سەعدی رادەگەیەنێت کە ئەو پەیڕەوی لە نەریتی پێشینان نەکردووە («لەشیعری پێشیناندا رێچکەی خوازەی تێهەڵکێشراوی گرتەبەر»). سەرەنجامیش بە بەرگریکردنێک لەخۆی کۆتایی پێ دێنێت:

ئامۆژگاریمان ئێمە خستەدەر     رۆژێکمان تێدا بردە سەر
ئەگەر نەهاتە گوێ ئارەزووی کەس     لەسەر پێغەمبەر گەیاندنەو بەس
یا ناظراً سَلْ بالله مرحمة     علی المصنف واستغفر لصاحبه
واطلُب لِنفسك منَ خیر تریدبها     من بعد ذلِكَ غفراناً لكَاتبه

سەعدی لە نزیکەی ٦٩١ کۆچیدا لە شیراز کۆچی دوایی کرد. ئێستا مەزارەکەی بۆتە پەرستگای عاریف و ئەویندارانی شیعری پارسی.

### گوڵچنێک لە گوڵستانی سەعدی

«بە دوو بازووی تواناو بە هێزی پەنجەی دوو دەست
خەتایە پەنجەیی بێ هێزو لاوازت کە بشکێنێ
لەپێ کەوتوو ببینی و لێی نەبوری دیارە ناترسی
لەپێ کەوت خۆی لە بۆ دەسگرتنی کەس دەستی بۆ بینێ
کەسێ تۆوی بەدیی چاندو تەمای بوو چاکە بەرهەم بێ

دەماغی بلح و بێ کەڵکە خەیاڵی پووچ ئەجوولێنێ
لە گوێی خۆت لوکە دەربێنە و بپرسە وادەی ئەم خەڵکە
ئەگەر نەیپرسی دادرەس بۆ سبەینێ تۆڵەی ئەستێنێ»
(بەشی یەکەم، چیرۆکی دەیەم)

«ئینسان ئەندامی لەشی یەکترن    لە ئەسڵی سروشت لەیەک گەوهەرن
کە ئەندامێکی ئازاردا رۆژگار    هیچ ئەندامکی تر نای مێنێ قەرار
لە دەردی کەسان کە تۆ بێ خەمی    ناشێ کە ناوت بنێن ئادەمی»
(بەشی یەکەم، چیرۆکی دەیەم)

«دێتە بیرم هەروەها شیعرێکی وت    فیلەوانی بوو لە گۆی دەریای
نیل حالی میلوورە لە ژێر پێتا وەکو    حالی تۆ وایە لە ژێر دووقاچی
فیل»
(بەشی یەکەم، چیرۆکی بیست ودووەم)

من ئەو مێرووەم پێم لێ ئەماڵن    نەک زەردەواڵەم کە لێم بناڵن
چۆنم بۆ بکرێ سوپاسگوزاری    کە نیمە توانای مەردوم ئازاری
(بەشی سێیەم، چیرۆکی دووەم)

لە گەڵیا تۆ گران مەدوێ کەسێ ئەدوێ کەوا ئاسان
لە قاپیی رێکیدا هەرکەس بە شەڕ تۆ بۆی مەچۆ مەیدان»
(بەشی هەشتەم، ئامۆژگاری پانزەیەم)

چاک و ئاسانە زیندووکەی بێ گیان    کوشتوو ناتوانی زیندووکەیتەوە
خۆ مەرجی عەقڵە هێواش تیرباوێ    لە کەوان دەرچوو ناگەرێتەوە»



(بەشی هەشتەم، ئامۆژگاری پێنجەسێیەم)

«بەنەقاقشانی چینی وت فەرەیدون
کە بۆ کەرگەل کۆپانی جوانی بدروون
بەدان چاک راگرە ئەی مەردی هۆشیار
کە چاکان گەورەن و پیرۆز کردار
(بەشی هەشتەم، ئامۆژگاری سەدو چوارەم)

لە دەستت دێ وەکو خورما بە خاوەنی بەخشش
لە دەستت گەر نەیە باوەک سەرو بە تۆ ئازاد
(بەشی هەشتەم، ئامۆژگاری سەد و دەیەم)

**پەراوێزەکان:**

1-voir Joseph Lin: Le Tao,p.128.

2- Ibid.

3- Ibid,chapitre 34.

4- Ibid,chapitre 40.

5- Ibid,chapitre 11.

6- Ibid,chapitre 12.

7- Ibid,chapitre 63.

8- Ibid,chapitre 31.

9- Pour toutes les citations voir Paul Carus:*L  Evangile du Buoddha*, Paris, Ernest Laroux,1902 et Maurice Percheron:*Le Bouddha et le bouddhisme*, Paris, Seuil,1956.

10- Paul Carus: *L Evangile du Bouddha,* op. cit., p. 193.

11- cit  in Unto Tahtinen: *Ahimsa*, Reider and Co.London, 1976,p. 58.

12-Paul Carus: *L  Evangile du Boddha*, op. cit,p.46.

13- Ibid, p.82.

14- Ibid, p. 114.

15- Ibid, p. 138-139.

16- Ibid, p. 153.

17- Ibid, p. 195.

18- Ibid, p. 190-91.

19- *La Bhagavd-Gita*, Traduite par Emile Senart *Les Belles Lettres*, Paris, 1967, p.71.

20- Sri Aurobindo: *Essays on the Gita*,New York 1950, p.44.

21- Mahatma Gandhi: Truth is God, Navijivan Publishing  House, Ahmedabad  p. 94.

22- Mohadev Desai: *The Gospel of Selfless Action*, Navijivan Publishing House, Ahmedabad, p.130.

23-Radakrishnan: Indian Philosophy, vol I, George Allen and Unwin Limited, 1971, p. 522.



24- *La Bhagavad-Gita*, op. cit., II. 19.

25- Cit  in N. Shanta: La voie Jaina, Oeil Paris, 1985, p. 261.

26- Cit  in A.Guerinot: *La Religions Djaina* Paul Geuthner,  Paris, 1926, p. 213.

27- Cit  in *Religion and Non-Violence*

28- Cit  in Max Muller: *Sacred Books of the* East vol XL.X, Oxford, 1895, p. 309.

29- Ibid. vol XXII, p.12.

30- Cit  in N.shanta: La voie Jaina, op. cit., p. 262-263.

٣١- اسطوره ء زندگی زردشت، ژاله آموزگار، احمد تفضلی، تهران، ١٣٧٠ .

32- M. Boyce, *Zaroastrians*, London, 1979, p.18.

٣٣-دایرة المعارف فارسی، جلد اول، زیر نام  زردشت.

34-Jacques Duchesne-Guilemin:*Zoroastre*, Maisonneuve, 1948, p. 80.

٣٥-گاتاها ، گزارش پورداود، انتشارات دانشگاه تهران،١٣٥٤ .

36-Le *Criton* de Platon, Paragraphe 49. traduction francaise de leon Robin Biblioth que de la Pl inade Gallimard, Paris.1950. p.194.

37- Cit  in *La Sainte Bible*, traduction francaise Par l ecole biblique de Jerusalem, Cerf, paris,1972, p. 60.

٣٨- بۆ وەرگێڕانی دەقەکانی ئینجیل پەنامان بردەبەر: ئینجیلی پیرۆز- بەشێوەی کوردی سۆرانی، کۆمەڵەی دەولی کتێبی پیرۆز، هەولێر١٩٩٨ .(و.)

39-Elle sera compos e de 5000 membres en 1226.

40- Cit  in Ivan Gorly: *Saint Francois d  Assise*, Seuil, Paris, 1957,

p. 137.

41- Ibid, p.62.

42- Ibid, p.66.

43- Ibid, p.152.

44- Paul Ricoeur: *Le volontaire et l Involontiare*, Paris, 1967, p. 452.

45-Emerson: *Journals* vol IX, Boston, 1912, p. 562.

٤٦- هەموو دێرە شیعرەکانی لە گولستانی سەعدی، وەرگێڕانی مستەفا سەفوەت، پەخشخانەی ناجی، بانە١٣٧١ ، وەرگیراون.(و،)



**بەشی دووەم**

# دامەزرێنەرانی ناتوندوتیژی





## هێنری دێڤید تۆرۆ و

## بێداریی رۆحی تاک

«رۆژی بێداربوونەوەمان دێت.»

**هێنری دێڤید تۆرۆ**

هێنری دێڤید تۆرۆ (Henry David Thoreau) هزرڤانی ناتوندوتیژی بە مانای راستەقینەی پەیڤەکە نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، کاریگەرییەکەی لەسەر تیۆریستە سیاسییەکان و کەسایەتییە کۆمەڵایەتییەکانی ناتوندوتیژی لە سەدەی بیستەمدا، سنوورەکانی ئەمریکای باکووری بەزاندووە. ئەو کەسەی کە زیاتر لە سەدەیەک بە لاسایی کەرەوەی رالف والدۆ ئێمەرسۆن (Ralph Waldo Emerson)ی فەیلەسووفی ئەمریکی دەناسرا، ئەمڕۆ لە ریزی پێنج یان شەش لە گەورە نووسەرە ئەمریکیەکانی هەموو سەردەمەکاندایە. هەروەها ئەو کەسەی لە ماوەی کورتی تەمەنیدا، وەکو کەسێکی شێت و نامۆ لە لایەن خەڵکی شاری کۆنکۆرد (concorde)ەوە دەرکراو و فەرامۆش کرابوو، ئێستا بە یەکێک لە دامەزرێنەرانی تاکگەرایی دیموکراتیک دەناسرێت. وێرای ئەوەی کە هەندێک بە دژە دەوڵەت و کۆمەڵێکی تر بە ئیکۆلۆجیستی لە قەڵەم دەدەن، ماوەی سەد ساڵە تۆرۆ لە سەنتەری وتووێژەکاندا لەمەڕ بەرەنگاربوونەوەی جەماوەری و مافەکانی تاکەکەسی رووبەڕووی حکومەت راوەستاوە. کتێبە بە ناوبانگەکەی والدن (Walden)، و نامیلکە بچووکەکەی لەمەڕ سەرپێچیکردنی مەدەنی(Désobeissance Civile) بوون بە سەرچاوەی ئیلهامی کەسایەتییە گەورەکانی مێژووی مودێرن، وەک



تۆلستۆی، گاندی وکینگ. لیۆ تۆلستۆی لە پەیامیدا بۆ خەڵکی ئەمریکا (Message Adressé au Peuple Américain) لەم بارەیەوە دەنووسێت:

«ئەگەر بڕیار بێت شتێک بە خەڵکی ئەمریکا بڵێم، حەز دەکەم بەو بۆنەوە سوپاسیان بکەم، کە ئەو نووسەرە ئەمریکیانەی لە دەوروبەری ساڵی ١٨٥٠ هاتنە مەیدان، زۆر یارمەتییان دام. لە ناویاندا ناوی گاریسۆن (Garrison)، پارکەر(Parker)، ئێمەرسۆن، بالۆ (Ballou) و تۆرۆ ببەم کە نەک تەنیا لە بیریارە هەرە گەورەکانن بەڵکو کەسایەتییان کاریگەرییەکی زۆری تێکردم...»[١]

گاندی یەکەم جار لە کتێبخانەی گرتووخانەدا لە ئەفریقای باشوور، نامیلکەی هێنری تۆرۆی لەمەڕ سەرپێچیکردنی مەدەنی بینی، چەند ساڵێک دواتر دەنووسێت:«نامیلکەی مامۆستایانەی تۆرۆ پاڵپشتی زانستیانەی کارێک بوو کە من خەریکی ئەنجامدانی بووم.»[٢]

«مارتین لۆتەر کینگ»یش چەند جارێک لە گوتە و نووسینەکانیدا ناوی تۆرۆ دەبات، لە کتێبی هەنگاوێکی گەورە بەرەو ئازادی (Stride Toward Freedom)دا دەڵێت: «کاتێک کە خەیاڵم بەرزتر دەفڕێت، بەو ئەنجامە دەگەم کە ئەو شتەی ئێمە بە راستی خەریکی ئەنجامدانی بووین، ئەوە بوو کە دریغی بکەین لە پاڵپشتیکردنی سیستەمێکی شوم، لە کاتێکدا کە تەنیا دەتوانین دریغی لە پاڵپشتیکردنی ئابووری کۆمپانیای گواستنەوە بکەین. لەم بارەوە نامیلکەی سەرپێچیکردنی مەدەنی تۆرۆ کەوتەوە بیرم. وەبیر خۆم هێنایەوە ئەو کاتەی کە بۆ یەکەمین جار لە کۆلیژ خوێندمەوە چ کاریگەرییەکی لە سەر من بەجێهێشت. بەم شێوەیە گەیشتمە ئەنجام کە ئەوەی ئێمە خەریک بووین لە مۆنتگۆمێری (Montgomery) ئەنجامی بدەین پەیوەندی هەیەبەئەوەی کە تۆرۆ پێش ئەمە گوتبووی.»[٣]

ئەم وتەیەی کینگ باس لەو هەستە دەکات کە چەند نەوەیەکی ئەمریکییەکان لەمەڕ خوێندنەوەی نامیلکە بە ناوبانگەکەی تۆرۆ هەیانبووە. ئەوانیش وەک کینگ، گاندی و تۆلستۆی، لەو باوەڕەدان کە تۆرۆ پاڵەوانی بەرەنگاربوونەوەی تاکەکەسییە لە بەرامبەر یاسا نادادپەروەرەکانی حکومەتی ئەمرۆ. لەگەڵ ئەوەشدا تۆرۆ بەو مانایەی کە شۆڕشگێڕەکانی وەکو باکۆنین (Bakounine)، مالاتێستا (Malatesta) و کرۆپۆتکین (Kropotkine) دژە حکومەتن، وەکو ئەوان دژە حکومەت نییە. کەڵکەڵە و خەمی تۆرۆ بایەخدانە بە گۆڕانی دەروونی تاک و بەرز فڕییەکەی زیاتر لایەنی مەعنەویی هەیە تاکو سیاسی. بۆیە، کە دەسەڵاتی حکوومەت ڕەتدەکاتەوە، لە پێناوی بەرگریکردنە لە هۆشیاریی تاکەکەسی نەک لە پێناوی خستنەڕووی ئایدیۆلۆجیایەکی سیاسیدا. بە دەستەواژەیەکی تر، هزری سیاسیی تۆرۆ خاوەنی پەرچەکردارێکە لە پێش توانای دانەبڕاوی مرۆڤ لە پێشکەوتنی مەعنەویدا. کەواتە تۆرۆ بە ناوی بێداریی مەعنەویی تاک و ئازادییە ئەنتۆلۆجیەکەیەوە یاسا نادادپەروەرەکانی حکومەت ڕەتدەکاتەوە. بە بڕوای تۆرۆ پێویستە هاوولاتی گوێڕایەڵی لە حکومەتێک نەکات کە لەگەڵ ئەو یاسا گشتیانەی کە لە قوولایی بووناندا هەن نەگونجێت. تۆرۆ دەنووسێت: «پێم وایە سەرەتا پێویستە مرۆڤ بین ئینجا گوێڕایەڵ یان شوێنکەوتە.»[٤] لە ڕاستیدا گرنگی ئەم دادوەرییە لەو شتەدایە کە نەک لە لایەن سیاسییەکی چالاک کە هەوڵی گەیشتن بە دەسەڵاتی سیاسی دەدات، بەڵکو لە لایەن تاکگەرایەکی مەعنەویی خوازیاری دەرککردنی جەوهەری جیهان دەردەبڕێت. لە هەمان ڕووەوە، تۆرۆ لە یاداشتەکانیدا دەنووسێت: «من عاریفم، ترانساندانتالیستم ( پەیڕەوی فەلسەفەی باڵاخوازی)، زیاد لەوەش، فەیلەسووفێکی سروشتگەرام.»[٥]

تۆرۆ بە ئیلهام وەرگرتن لە کتێبی «سروشت» (Nature)ی ئێمەرسۆن



(لەو ماوەیەدا خوێندیەوە کە قوتابی بوو لە زانکۆی هارڤارد) و بە ئیلهام وەرگرتن لە بەرهەمەکانی ڕۆمانتیکە ئەڵمانی و ئینگلیزەکانی وەک کۆلریج (Coleridge)و وۆردس وۆرس (Words worth) و گۆتە، ئایدیالیزمی پۆست کانتیی تۆماس کارلایل (Thomas Carlyle)، بە سیمبۆلی نوێبوونەوەی ژیان دەناسێنێت. ئەو هەمیشە هەوڵی دۆزینەوەی بنچینەی ژیان و یەکێتیی ڕۆحی لەگەڵ جەوهەری جیهان دەدات. لە ساڵی ١٨٤٥ کونجی خەلوەت هەڵدەبژێرێت و پەنا دەباتە بەر دارستان. لە ڕۆژی سەربەخۆیی ئەمریکادا، لە کۆڵیتێکدا کە خۆی لە کەناری گۆمی والدن (Walden)دا لە داری کاژ دروستی کردبوو، نیشتەجێ دەبێت. دوو ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە و ئەزموونێکی شاعیرانە بە دەست دەهێنێت کە دەبێتە سەرمایەی بەرهەمەکەی والدن. تۆرۆ لە کتێبی والدندا چەند جارێک داوا لە مرۆڤەکان دەکات لە سنوورەکانی هزری بۆماوەیی بکۆڵنەوە و بەم شێوەیە ببنە خاوەن ژیانێکی دەوڵەمەند وکامڵ. دەنووسێت: «پێشینان گوتوویانە ئەوەی کە ناتوانی ئەنجامی بدەی، وازی لێ بهێنە ودان بەوەدابنێ کە ناتوانی ئەنجامی بدەی. ڕووداوەکانی ڕابردوو موڵکی ڕابردووەکانن و ڕووداوە نوێیەکان موڵکی لاوەکانن.»[٦] بەردەوام دەبێت و دەڵێت: «هیچ کاتێک درەنگ نییە، بۆ ئەوەی حوکمە پێشینەکان بخەینە لاوە. هەر شێوازێکی هزر یا خود ئەرک هەر چەند کە کۆنیش بێت، ناتوانین بێ هۆ بڕوامان پێ هەبێت و دڵنیابین لێی.»[٧] بەم شێوەیە، لەلای تۆرۆ ناسینی واقیعی ژیان، وەکو بەدیهاتنی ئامانجی بوون وایە؛ و بۆ ناسینی واقیعی ژیان، پێویستە خۆمان بناسین. بە بڕوای تۆرۆ، ئەو خۆناسییە لەسەر بنچینەی پشت بەستنە بە خودی بێ کۆتایی مرۆڤ وەک ئافەریدەیەکی خوا. بەڵام بۆ دۆزینەوەی خودی سەرەکی مرۆڤ پێویستە ڕوو بکەینە بنچینە نوێیەکان و هەلومەرجە مەعنەوییەکان سەر لە نوێ دروست بکەینەوە و دەست هەڵگرین لە بیروباوەڕ و نەریتە نادروستەکان. بە گوتەی

تۆرۆ: « لە شوێنێک راوەستین پێیەکانمان بجوولێنین و بە گڵ و لمی باوەڕ، حوکمەپێشینەییەکان، نەریت، خەیاڵپلاوی و رواڵەتدا بیانبەینە خوارەوە، پێیەکانمان بە نێو ئەو زیخ و لمانەدا کە سەرتاسەری زەویان هەر لە پاریس تا لەندەن، لە نیویۆرک تا بۆستن و کۆنکۆرد، کەنیسە و حکومەت، شیعر و فەلسەفە و ئایینیان داپۆشیوە، هێندە بیانبەینە خوارەوە تا بگەین بە ئاستێکی جێگیر و بەردە پتەوەکان، بەو شتەی کە دەتوانین بە راستیی ناو ببەین و بڵێین: «ئیتر ئەمە هەڵە نییە.»[٨]

بەم پێیەش تۆرۆ داوامان لێدەکات جارێکی تر هەموو شتێک ببەینە ژێر پرسیارەوە تا بتوانین بە دیدێکی نوێ لە جیهان بڕوانین. بە بۆچوونی ئەو، گۆمی والدن باشترین شوێنە بۆ ئەم نوێکردنەوە رۆحییە. هەموو رۆژێک بەیانی زوو لە خەو هەڵدەستێت تا وەکو هیندۆسەکان خۆی لە گۆمەکەدا بشوات. چونکە بە بڕوای ئەو: «ئاوی پاکی والدن تێکەڵ بە ئاوی پیرۆزی گۆنگ دەبێت.»[٩] لە پاش ئەم خۆ شوشتنەی بەیانیان، تورو چاوی رۆح پاکدەکاتەوە و ئامادە دەبێت بۆ خوێندنەوەی بهگود-گیتا. ئەو دەنووسێت: «بەیانی، عەقڵ لە ناو فەلسەفەی سەرسوڕهێنەر و جیهانی دروستبوونی بهگود-گیتادا دەشۆم، ئەو بەرهەمەی کە نووسینەکەی دەگەڕێتەوە بۆ رۆژگاری خوایی، و جیهانی ئەمڕۆ و ئەدەبیاتی ئێمە بە بەراورد لەگەڵیدا زۆر ئاسایی و بێ نرخ دەردەکەون...»[١٠] وەک دەبینین تۆرۆ بە راستی پەیڕەوی ڤدایە. بەو مانایەی کە بەرهەمە ڤداییەکان دەریدەبڕن، ئەو خوازیاری مەعریفەیە. حەز لە یوگا دەکات و خۆی بە یوگی ناو دەبات. لە نامەیەکدا بۆ هـ. ج. ئۆ. بلاک (H. G. O. Blake) دەنووسێت: «ئەوەی لە قووڵایی بیرکردنەوەدا نوقم بێت، یوگی دەوروکاریگەریی دەبێت لە دروستبوونیدا. ئەو بۆنێکی مەلەکوتی هەڵدەمژێت، شتگەلێکی سەیر دەبیستێت. شتە مەلەکوتییەکان بەناو ئەودا تێدەپەڕن بێ ئەوەی بیدڕن، و ئەو لە هاتوچۆدایە، بە پێی سروشتی



خۆی، وەک بڵێی گیان بە ماددەی سەرەکی دەبەخشێت، تارادەیەک و هەندێک جار منیش یوگییم.»[١١]

بایەخدانی تایبەتی تۆرۆ بە ئەدەبی پیرۆزی هیند، جیای دەکاتەوە لە هەموو پەیڕەوانی تری هزری ئامادییانەی ئەمریکی. لەگەڵ ئەوەشدا، تۆرۆ لە حەز کردنی لە کتێبە پیرۆزەکانی هیندی قەرزاری ئێمەرسۆنە. چونکە یەکەم جار لە کتێبخانەی ئێمەرسۆن دا یاساکانی مان (Lois de Man ow) لە وەرگێڕانی سێر ویلیام جۆنز (Sir Wiliam Jones)ی بینی. بە گوتەی پێری میللەر (Perry Miller) لە کتێبی خۆناسی لە کۆنکۆرد (Consciousness in Concorde)دا تۆرۆ بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٨٤١ لە پاش خوێندنەوەی کتێبی جێراندۆ (Gerando) بە ناوی مێژووی پراکتیکیی سیستمە فەلسەفییەکان Histoire Compar e des Syst mes de Philosophie بە ئایینی رۆژهەڵاتی ئاشنا بوو.[١٢] بەم شێوەیە لە ساڵەکانی دواتردا هەوڵیدا هەندێک لە دەقە پیرۆزەکانی هیندی، وەکو سادارامـا پانداریکا سوترا (Saddharama Pandarika) (Sutra) و لوتوس سوترا (Lutus Sutra) بۆ بڵاوکراوەی ئێمەرسۆن The Dial وەربگێڕێت. لە ساڵی ١٨٤٩، تۆرۆ بە بڵاوکردنەوەی کتێبی هەفتەیەک لە کۆنکۆرد و رووباری مێریماک (Aweek on the Concorde and Merrimack Rivers) دا تا رادەیەک ئایینی هیندۆسی و بوودایی بە تەواوی پەسەندکرد ولە هەمان کاتدا بە ترانساندانتالیستیش مایەوە. دەڵێت: «دەزانم هەندێک کەس کە ناوی حەزرەتی مەسیح لە تەک ناوی بوودادا ببینن حوکمی توندم بەسەردا دەدەن، بە دڵنیاییەوە من هانیان دەدەم مەسیحەکەیان خۆشتر بوێت لە بوودای من. چونکە گرنگ خۆشەویستییە، منیش حەزرەتی مەسیحم خۆشدەوێت.»[١٣]

تۆرۆ بە وەسفکردنی حەزرەتی مەسیح وەک ئاڤاتاری خوایانی هیندۆسی پەیوەندی لە نێوان مەسیحیەت و ئایینی بوودایییدا بەرقەرار

دەکات. هەروەها لەرێی خستنەرووی یەکێتیی رۆحی و مەعنەویی لەگەڵ گەورە شاعیری ئێرانی سەعدی لە میانەی فەزا و کاتدا نزیکیی مەعنەوی خۆی لە سەعدی ئاشکرا دەکات و رادەگەیەنێت. تۆرۆ دەنووسێت: « تەنیا هزری بەرز مرۆڤە هاوئایینەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە. هەمیشە چەند رەگەزێکی کەم بایەخن کە دەبنە هۆی دروستکردنی ناکۆکی لە نێوان ئایینەکاندا. لە پشت فرەوانترین گەرداوەکانی کاتدا،لەرێی نیشانەگەلێکی هەرە یەکلابووەوەی هزر، هزر دەناسێتەوە. بۆ نموونە من دەزانم کە لە رابردوودا سەعدی وەکو من بیری دەکردەوە، بۆیە ناتوانم قایل ببم بە جیاوازییەکی سەرەکی لە نێوان خۆم و سەعدیدا. بۆ من سەعدی بێگانە نییە، نەوەک ئێرانییەک و نە تاکێک لە رۆژگارانی رابردوودا، ئەو بەهۆی لێکچوونی هزرمان لەناخی مندا ماوەتەوە. جیاوازیی گەردیلەکانمان چ گرنگییەکی هەیە؟ سەعدی سەبارەت بە من لە یەکدڵی و تاکایەتییەکی زیاتری نەبووە، خودی ئەو قووڵتر، گرنگتر و پیرۆزتر نەبووە لەوەی کە ئێستا لە هزری مندا بە شێوەیەکی ئەبستراکت دەخرێتەروو. لەرێی بە هاودڵیمان لەگەڵ سەعدی دا، دەبینە هاوشێوەی ئەو. فکر و بیرەکەی نموونەیەکە کە لە ئەودا هەمە، پارچەیەکی دڵی ئەوە کە دەبێتە هۆی ئەوەی ئیتر ئێسقانەکانی ئەم هزرڤانە لە هەر کوێ ئارام بووبن هیچ گرنگییەکیان نەبێت، بەڵکو ئەم خاوەندارێتییە، تاکێکی وەکو ئەو دەهێنێتە ئاراوە. مرۆڤێک کە لە نێو نەوەی داهاتوودا ناوبانگ دەردەکات، جیاوازییەکەی لەگەڵ ئەو نەوەیەدا کە مانەوەی وی، و جیاوازیی لەگەڵ ئەوانی دی لە یەک جیهاندا گرنگ نییە. من پێم وایە دەتوانم لەگەڵ خۆرسکی مرۆڤێکی گەورە لە رابردوودا هاوشێوە بم، رەنگە بتوانین بڵێین بە قەد ئەوەی ئەو هاوشێوەی خۆیەتی.»[١٤] کەواتە تۆرۆ دەریدەخات کە رۆحانیەت لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا وەک یەک رێزی لێدەگیرێت. لەگەڵ هەموو ئەمەدا تۆرۆ لەبەر دوو هۆی سەرەکی جەخت دەکاتە سەر نرخ و گرنگیی



عاقڵمەندە رۆژهەڵاتییەکان: یەکەم ئەوەیە کە تۆرۆ مەبەستییەتی ئایینەکانی رۆژهەڵات بە ئەمریکییەکان بناسێنێت، دووەم، ئەخلاقی رۆژهەڵاتی پشت ئەستوور بە خاکەڕایی و لێبوردەیی لە بەرامبەر ئەخلاقی سوودخوازانەی نیو ئینگلاند دابنێت. لەم بارەیەوە، لە کانوونی دووەمی ١٨٤٣دا لە بڵاوکراوەی The Dial دا رستەیەکی تۆرۆ بەرچاو دەکەوێت: «ناشێ باج لە براهمانییەک وەربگیردرێت.»[١٥] لەم رێڕەوەدا کە تۆرۆ لە ساڵی ١٨٤٨ لە یاریگای کۆنکۆرد (Concorde Lyceum) دا زنجیرە وتارێکی پێشکەش کرد. لەم وتارانەدا کە ساڵێک دواتر لە ژێر چاودێری ئەلیزابێس پیبۆدی (Elizabeth Peabody) لە شێوەی نامیلکەیەک لە بڵاوکراوەی «Aesethetic Papers»دا بە چاپ گەیشت، تۆرۆ بیرۆکە بانگەوازی ویژدانی تاکەکەسی لە بەرامبەر یاسا سەپێندراوەکانی حکومەتدا خستەڕوو. بەم شێوەیە ئەویش وەکو ئانتیگۆن، ئەوەی کە بە «یاسایە باڵاترەکان»ی ناونان و بە هەمیشەیی و نەمری لە قەڵەمدان، خستییە بەرامبەر ئەو یاسایانە وە کە سیاسەتمەداران دایاننناون. بە گوتەیەکی تر، بە پشت بەستن بە چەمکی راستی، یاسای ئەخلاقیی لە بەرامبەر یاسای سیاسییەوە بەناوی هەمان راستییەوە کە بە بڕوای ئەو خستە خۆشەویستی گرنگترە، پارەوپول و نێوبانگ، داوا لە هاوولاتییان دەکات بۆ سەرپێچیکردنی مەدەنی. تۆرۆ کە لە بەرگری کردن لە ئازادییە تاکەکەسییەکان لە بەرامبەر یاساکانی پاراستنی کۆیلەداری حکومەتی ئەمریکا ئاگاداربوو، وەک مرۆڤێکی هۆشیار دەرکەوت کە بە دوای دۆزینەوەی دادپەروەری راستەقینەدا بە کانیاوێک گەیشتبوو. ئەو دەنووسێت: «ئەوانەی کە کانیاوە سازگارترەکانی حەقیقەت پێ نازانن و رێی ئەو سەرچاوانەیان نەگرتۆتە بەر، عاقڵانە ئیکتیفا بە ئینجیل و یاسای بنچینەیی دەکەن و بە ئەدەب و خاکەڕاییەوە لە کانیاوەکە دەخۆنەوە. بەڵام ئەوانەی لە نێو تۆرێکی تەنکدا دەکەونە نێو ئەم دەریاچە

یاخود گۆمەوە و بە ناویدا دەگەڕێن و دەسوڕێن، جارێکی تر بۆ رزگار بوون ئامادە دەبن و بەنییەتی سەردانی سەرچاوەی تور درێژە بە رێگاکە دەدەن.»[١٦]

بەم تێڕوانینە، تۆرۆ وەک یەکێک لە پێشڕەوانی بیری تاکگەرایی دیموکراتیک، هەروەها وەک کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتیی ناتوندوتیژی دەردەکەوێت. بە بڕوای تۆرۆ ماف و ئەرکی هەموو تاکێک ئەوەیە کە سەرپێچی لە حکومەتێک بکات کە پشتیوانی لە کۆیلەداری دەکات یاخود بۆ زاڵبوون بەسەر ئەوانی تردا شەڕێکی نادادپەروەرانە هەڵدەگیرسێنێت (ئەو لێرەدا ئاماژە بە کوشتنی سووریپێستەکان بە دەستی ئەمریکییەکان دەکات). دەڵێت: «تەنانەت بۆ ساتێکیش ناتوانم دان بەو رێکخستنە سیاسییانە دابنێم، چونکە رێکخستنانە موڵکی حکوومەتی کۆیلەدارین.»[١٧] تۆرۆ لە دوای بەرگریکردن لە جۆن براون کە یەکێک بوو لەو ئەمریکیانەی کە لایەنگری نەهێشتنی کۆیلایەتی دەکرد، لەبەر هێرشکردنی بۆ سەر جبەخانەی حکوومەتی هارپێرس فێری (Harpers Ferry) لە ڤیرجینیا دادگایی کراو لە سێدارە درا، باج بە حکومەتی ئەمریکا نادات. بە بۆچوونی تۆرۆ، جون براون نیشانەیەکی تەواوی بیرۆکەی سەرپێچیکەرە. لە نووسینێکدا بە ناوی: بەرگریکردنێک لە جۆن براونی فەرماندە(A Plea for Captain John Brown)، وەکو تاکێکی «لە بنەڕەتدا ترانساندانتالیست» باسی دەکات کە لە بەرامبەر ستەمی پارێزگارانی کۆیلەداری خۆڕاگر بوو.»[١٨] لەگەڵ ئەوەش تۆرۆ لەم نووسینەدا کەمێک لە بیرۆکەی «شۆڕشی ئارام» کە لە نامیلکەکەیدا بەناوی سەرپێچیکردنی مەدەنی باسی لێوە کردووە، دەکشێتەوە. ئەو لەم نامیلکەیەدا دەنووسێت: «من خوازیاری رووبەڕووبوونەوە نیم لەگەڵ هیچ مرۆڤێک یاخود نەتەوەیەک، من نامەوێت فوو لە ئاگر بکەم، و خەریکی جیاوازییە جوزئی و جوانەکان بم و بە دوای ئەوانە دا بگەڕێم کە باشترن



لەوانەی دەوروبەرم. من زیاتر لە هەوڵی دۆزینەوی پاساوێک دام تا خۆم لەگەڵ یاساکانی وڵات بگونجێنم و زۆر ئامادەی خۆگونجاندنم... لەو باوەڕەدام حکومەت زوو باری ئەم ئەرکە لەسەر شانم دەهێنێتەخوار و ئەوکات وڵاتپەروەرێکی باشتر نابم لە هاونیشتمانییەکانم. ئەگەر واز لە خۆپەسەندی و لەخۆبایی بوون بهێنین و بە چاوێکی کراوەتر بڕوانین، یاسا بنچینەییەکەمان وێڕای هەموو کەم و کوڕییەکانی، زۆرباشە؛ یاساو دادگاکانمان زۆر شایستەی رێزن، ئەم حکوومەت و دەوڵەتەی ئەمریکا لە هێندێک رووەوە دەگمەن و شایەنی ستایشکردنە و پێویستە لە بەرامبەریدا ماف وئەرکی خۆمان بناسین و هاوڕابین لەگەڵ ئەو وەسفەی کە گەلێک کەس کردوویانە...»[١٩] بەم پێیە، دیارە کە تۆرۆ رێز لە یاسای زۆرینەی دیموکراتی دەگرێت. وێڕای ئەمەش پابەند دەبێت بە بیری «دادپەروەریی رەها». بە بۆچوونی ئەو، پێویستە دەسەڵاتی خەڵکی لەگەڵ دادپەروەریی رەها و راستیدا بگونجێت. بەم شێوەیە ئەو وەک کەسایەتیەک لە جۆن براون دەڕوانێت کە لایەنگری راستییە. بە بۆچوونی تورو، ئامانجی براون و ئەو هۆکارەی کە بەکاری هێناوە هەردووکیان پەسەندن. وێڕای ئەوەش، ئەو زیاتر سەرنجی «گیانی بەرەنگاربوونەوەی» جۆن براون دەدات نەک ئەو چەکانەی کە ئەو بۆ بەرگریکردن لە خۆی لە بەرامبەر پارێزگارانی کۆیلەداری بەکاری هێناون. چونکە دەڵێت: «زانینی ئەوەی چ چەکێک بەکاردەهێنین گرنگ نییە، بەڵام ئەوە گرنگە کە بە چ مانایەک بەکاری دەهێنین.»[٢٠] بە بڕوای ئێمە راست نییە ئەگەر بمانەوێت تەنیا لە میانەی ئەم رستەیەوە حوکم لە بارەی هەموو ژیانی تۆرۆ و بەرهەمەکانی بدەین. لە راستیدا، لەبەر جیهانبینی و بەکارهێنانی ئاشتیخوازانەی سەرپێچیکردنی مەدەنی دەتوانین تۆرۆ بە هزرڤانێک لە قەڵەم بدەین کە بەشدارییەکی شایستەی هەیە لە پێشخستنی هزری ناتوندوتیژیدا و بێگومان ژمارەیەکی زۆری ئەو ئەمریکی و ئەوروپییانەی کە پەنادەگرن لە ناتوندوتیژی سوودیان

له ئەزموونی تۆرۆ وەرگرتووە بۆ گرتنەبەری ستراتیژیەتێکی نوێ لەبارەی ناتوندوتیژی. هەروەها لە هیندستان تۆرۆ بە یەکێک لە مامۆستا بیریارەکانی گاندی دەژمێردرێت. هەڵبەت لەمەڕ گاندییەوە هەمیشە شایەدی ناهاوکاری و ناتوندوتیژی بەردەوام بووین. بەڵام وێڕای ئەوەی کە هزری ناتوندوتیژیی تۆرۆ جیاوازە لەگەڵ گاندی هەمدیس تۆرۆ لە کەسایەتییە ئاشتیخوازەکانی ئەمریکایە. ناتوانین ئەو بە فەیلەسوفی دژە حکومەت ناو ببەین. چونکە لە هەوڵی لە ناوبردنی حکومەتی دیموکراتیدا نییە. ئامانجی ئەو دۆزینەوەی ڕێگاگەلێکە بۆ نەهێشتنی ئەو هەلومەرجانەی کە مرۆڤەکان و حکوومەتەکان بەرەو توندوتیژی پەلکێش دەکەن. لە زەینی تۆرۆدا، ئەم ڕێگایانە بەر لە هەر شتێک ڕۆحین، چونکە بە بۆچوونی ئەو پێویستە مرۆڤ لە لایەنی دەروونییەوە بگۆڕێت. بە بڕوای ئەو، مرۆڤناسیی مەعنەوی پێشترە لە لۆجیکی سیاسی، پێویستە ژیان و بەرهەمەکانی هێیزی دیڤید تۆرۆ لە هەمان زەمینەدا ڕاڤە و شرۆڤە بکرێن. چونکە بە هەمان شێوەی کە ئێمەرسۆن لە گوتەی بە خاک سپاردنەکەیدا دەڵێت: «تۆرۆ وتارخوێن و لە کرێکارەکانی حەقیقەت بوو... گیانی ئەو بۆ کۆمەڵگایەکی باڵاتر خولقابوو...»[٢١]



# لیۆ تۆلستۆی

## بەرگری نەکردن لە بەرامبەر خراپەدا

« تۆ دەتەوێ خراپە بە خراپە ڕیشەکێش بکەی، ئەم شتە مومکین نییە، خراپە مەکە تا خراپە نەبێت.»

(**تۆلستۆی:** باوەڕم بە چی هەیە؟)[٢٢]

لیۆ تۆلستۆی لە ڕوسیا و سەرتاسەری جیهاندا وەکو موژدەهێنەری گەورەی ناتوندوتیژی لە سەدەی بیستەمدا ناسراوە. کەسانێکی زۆر وێڕای ئەوەی ستایشی توانای نووسەری یاخود دادوەرییە ئەخلاقییەکانی ئەو دەکەن، بە هزرڤانێکی گەورەشی دانانێن. بۆ نموونە دەستەواژەیەک لە نامەکەی برتراند ڕاسل دەگوازینەوە کە لە ساڵی ١٩٠٤ بۆ لویس دیکنسۆن (Lowes Dickinson)ی نووسیوە، تیایدا دەڵێت: «بەخت ڕەشییەکی گەورەیە بۆ نەژادی مرۆیی کە تۆلستۆی توانای بەڵگەهێنانەوەی کەمە.»[٢٣] هەروەها ئایزایا بەرلین (Isaiah Berlin) لە نامیلکەی «تۆلستۆی و ڕوشنگەری»دا باوەڕی یەکێک لە ڕەخنەگرەکانی سەدەی نۆزدەیەم لە بارەی تۆلستۆی دەگوازێتەوە: «هەمیشە دوو شت لە بارەی تۆلستۆی گوتراون...، نووسەرێکی گەورەی چیرۆکە خەیاڵییەکان و بیرمەندێکی خراپە...» و بەرلین خۆی زیاد دەکات «ئەم حوکمە تارادەیەک گشتییە، سەدەیەکە بێ ڕکابەرە.»[٢٤] بەم پێیەش لە ڕاستیدا تاکو نەوەد ساڵ دوای مردنی تۆلستۆی، ڕەخنەگر و مێژوونووسانی بیروباوەڕەکان بە بەردەوامی لە بارەی بلیمەتییە ڕاستەقینەکەی تەبا و هاوڕان. ڕەنگە ئەم دادوەرییانە نیشانەی کەسایەتی ئاڵۆزی تۆلستۆی بن. لە لایەکەوە، ئەو نووسەرێکی فزولییە سەبارەت بە هەموو شتێک، چێژ لە وێناکردنی





کۆمەڵگای روسیای سەردەمەکەی وەردەگرێت؛ لە لایەکی ترەوە ئەخلاقگەرایەکی مەسیحییە کە تەنیا دادوەری لە بارەی ماهییەتی حکومەت و دەسەڵاتی کەنیسە لە روسیا دەکات. بەڵام حەزکردن لە میتافیزیکا و ئەم هەستی رەخنە توندە تایبەت نییە بە کەسایەتی تۆلستۆی پیرەوە، هەروەها لە تافی لاوێتیدا زۆر حەزی لە خوێندنەوەی بەرهەمی فەیلەسووف و ئەخلاقگەراکانی سەدەکانی هەژدە و نۆزدە بوو و ئەو بۆچوونی فەلسەفیی خۆی لەبارەی مەسەلە چارەنووسییەکانی مرۆڤ دەخستەروو. پاشان لە یەکێک لە نووسینە بەراییەکانیدا بە ناوی لاوێتی (Adolescence) نووسیی: «هیچ قوتابخانەیەکی فەلسەفی بە قەد قوتابخانەی گومانگەرایی سەرنجی رانەکێشاوم. لە راستیدا بۆ ساتێک منی بۆ حاڵەتێکی وەکو شێتایەتی پەلکێش کرد. تەسەورم دەکرد لە دەرەوەی مندا هیچ شتێک و هیچ کەسێک لە جیهاندا بوونی نییە، شتەکان ئیدی شت نین، بەڵکو وێنەن و هەر کە چیتر بیریان لێ نەکەمەوە خۆیان نامێنن. بە کورتی منیش وەکو شلینگ لەو باوەڕەدا بووم کە ئەمانە شت نین کە بوونیان هەیە، بەڵکو پەیوەندی ئێمەیە بە ئەوانەوە. هەندێ کات، ئەم هزرە جێگیرە وەها رایدەچڵەکاندم کە هەندێ جار بە جارێک وەردەگەرام و لە پرێکا لە شوێنێک کە خۆم نەدەدۆزییەوە چاوەڕێ بووم نەبوون و مردن بدۆزمەوە.»[٢٥] بەم شێوەیە یەکەمین خوێندنەوەکانی تۆلستۆی کار دەکەنە سەر هەموو ژیانی و لە بۆچوونە فەلسەفی و ئایندەییەکانیدا رێچکە دەبەستن. دیکارت لەو هزرڤانە یەکەمینە رۆژئاواییانەیە کە رێگای راڤەکردنی مانای ژیان، جیا لە پرەنسیپە دۆگمایی و بیروباوەڕییەکان فێرە تۆلستۆی دەکات. تۆلستۆی لە حەڤدە ساڵیدا بنەمای سەرەکیی فەلسەفەی دیکارت، واتە «من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم» راڤە دەکات و بە شێوەی «من دەخوازم، کەواتە من هەم» راست دەکاتەوە. کەواتە بە بۆچوونی تۆلستۆی، داواکردن مەرجی پێویستی



بوون (وجود)ی مرۆڤە. لە ساڵی ١٨٦٩دا، تۆلستۆی دەگەڕێتەوە سەر ئەم هزرە و بیرکردنەوەی فەلسەفی شۆپنهاوەر و تیۆری «خواستی ژیان» پەسەند دەکات (داواکردن جەوهەری جیهانە، هەر دەرکەوتنێکی فکری تابیعی داواکردنێکە، کەواتە تاکە شێوەی خۆشبەختی نەفی کردنی داواکردنە).

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، شۆپنهاوەر چەند بابەتێکی کەم لەمەڕ ئایینی مەسیحی و خۆشەویستی فێرە تۆلستۆی دەکات. لەم بوارەوە، کاریگەریی پاسکال دیارترە. تۆلستۆی دەنووسێت: «ئەم هزرە جێگەی خۆی بە هزرێکی تر دەدات، بە هزری پاسکال کە دەڵێت: ئەگەر بە تەواوی رێنماییەکانی ئایین راستیش نەبن، بە فێربوونیان شتێک لە دەست نادەین... لە ژێر کاریگەری ئەم هزرەدا، کەوتمە جەمسەری دژ (رکابەر)ەوە، زۆر لە خواترس بووم و بەبێ دوعا دەستم نەدەدایە هیچ کارێک»[٢٦]. لە ساڵی ١٨٧٤دا بوو کە تۆلستۆی کەم کەمە بە شێوەیەکی جیددی مەیلی بۆ ئایین چوو. لەم ماوەیەدا (لە نێوان ساڵەکانی ١٨٧٥ تا ١٨٨٠)، کە دوا قۆناغی قەیرانی ئایینی تۆلستۆیە کتێبی «پاسکال»ی دۆزیەوە. تۆلستۆی بوو بە شەیدای کتێبی هزرەکان (Pens es)ی پاسکال و برادەرەکانی خۆی ئامۆژگاری کردن بۆئەوەی ئەم کتێبە بخوێننەوە. بە هەمان شێوەی کەن. وایسبێین (N. Weisbein) لە نامیلکەی «گۆڕانی ئایینی تۆلستۆی (volution Religieuse de Tolstoi ) روون دەکاتەوە: «لە پێناسەیەکی زۆر قورس و زەحمەتدا مەعریفە لە رێی باوەڕی دڵ کە جیاوازە لە مەعریفە لە رێی عەقڵ و لۆجیکەوە، بە دوای دۆزینەوەی شوێنپێکانی لوجیکێکەوەین کە شتێکی دەروونییە و بە گوتەی پاسکال، عەقڵ و لۆجیک نایناسن. هەر چییەک بێت پێویستە لە یادمان بێت کە تۆلستۆی هەموو ئەو ساڵە قەیراناویانەی لە فەزایەکدا بەسەربرد کە پاسکال هێنابیبووە ئاراوە»[٢٧].

بەڵام خوێندنەوەی بەرهەمەکانی پاسکال، تاکە هۆکاری قەیرانی ئایینی تۆلستۆی نییە. ماوەی نێوان نووسینی بەرهەمەکانی گەنجێتی تۆلستۆی تاکو بڵاوبوونەوەی کتێبی دانپێدانانەکان (Confessions) قۆناغێکی کاریگەرە بە چەندین قەیران کە لە لایەنی ڕۆحییەوە یەکێکیان لەوی تر توندتر بوو. لەم قۆناغەدا دوو ڕۆمانی گەورەی شەڕ و ئاشتی (Guerre et Paix) و ئانا کارنینای نووسین. ئەو ڕۆمانانە لەمەڕ ماهییەتی دەسەڵات بوون کە تۆلستۆی بۆ یەکەمین جار بنچینەی تیۆرە سەرەکییەکەی لە بارەی ئانارشیزمی خۆبەدوورگر لە توندوتیژی بونیاتنا. لە دوای ئەم تێڕامانە فەلسەفیانەدا، تۆلستۆی بەو ئەنجامە دەگات کە گەندەڵی و ستەمی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی بەشێکن لە سیستەمی کۆمەڵایەتی-سیاسیی ڕوسیا.

تۆلستۆی ناوی کتێبەکەی بە ئیلهام لە جۆزێڤ پرۆدۆن (Joseph Proudhon)، نووسەری کتێبی شەڕ و ئاشتی: چەند تۆژینەوەیەک لە بارەی بنەما و دەستنیشانکردنی مافی تاکەکەسان[٢٨] وەرگرت. لە ژێر کاریگەرییەکی زۆری بۆچوونەکانی پرۆدۆن لە بارەی خاوەندارێتی و هەروەها میکانیزمی جەنگەکەیدا، پێناسەی باوی ڕەتکردەوە، ئەو پێناسەیەی کە سەرکەوتن و شکستی جەنگەکانی بە ئەنجامی بلیمەتیی تاکەکەسێک لە قەڵەم دەدا. کەواتە ڕۆمانی شەڕ و ئاشتی بوارێکی گونجاوی بۆ تۆلستۆی ڕەخساند تا بۆچوونی خۆی لەمەڕ مێژوو دەربڕێت. تۆلستۆی لەم ڕۆمانەدا، بێ توانایی ویستی تاک لە بەرامبەر مێژوودا، بۆ کەسایەتییەکانی بە تایبەتی بۆ «پیر» دەردەخات. پاشان بە بۆچوونی تۆلستۆی، تاک لە خەیاڵچنیی هەڵبژاردندا تەسەور دەکات کە بە هۆی خۆی و بۆ خۆی دەژیت، لە کاتێکدا بە ڕاستی ئەو ئامرازی دەستی مێژووە و مێژوو ئەو هەڵدەسووڕێنێت تاکو بە مەبەستەکەی بگات. هەروەها ئەوانەی کە لە هەوڵی گەیشتن بە دەسەڵاتن، تەسەور دەکەن کە دەتوانن



مێژوو بنەخشێنن و ببنە ئازادترین مرۆڤ. بەڵام بە بڕوای تۆلستۆی، دەسەڵاتداران ئازادیەکی کەمتریان هەیە. کەواتە پێویستە لە نێوان دەسەڵات و ئازادیدا یەکێکیان هەڵبژێرین. چونکە ئەو کەسەی کە بە دوای گەیشتن بە دەسەڵاتەوەیە ناتوانێت لە دەروونی خۆیدا و لە پەیوەندیدا لەگەڵ ئەوانی تر بە ئارامی بگات. بەڵام تۆلستۆی پێمان دەڵێت بەبێ دۆزینەوەی خوای ئامادە و زیندوو ناتوانین ئەم ئارامییە دەروونییە بە دەست بهێنین. بە بۆچوونی تۆلستۆی، خوا ژیانە، کەواتە بەبێ داواکردنی خوا ناتوانی خوازیاری ژیان بی. ئەمە بەو مانایەیە کە بە بۆچوونی تۆلستۆی، داواکردنی خوا تەنیا لەو ڕووەوە مومکینە کە مرۆڤ بە خۆرسک توانای ئەوەی هەبێت بە دوای زاتی خۆیدا بگەڕێت. بەڵام کە دەڵێین مرۆڤ بە خۆرسک خوازیاری دۆزینەوەی خوایە، لەبەر ئەوەیە کە مەعسوم و بێ تاوان هاتۆتە جیهانەوە. کەواتە خراپە لە مرۆڤدا لە ئەنجامی کاریگەری دام و دەزگا کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا دروست دەبێت. لێرەدا تێدەگەین کە تۆلستۆیش بڕوای ڕۆسۆ پەسەند دەکات کە دەڵێت مرۆڤ بە باشی لە دایک دەبێت، بەڵام شارستانیەت بەرەو گومڕایی پەلکێشی دەکات. بەم شێوەیە تۆلستۆی پرەنسیپی «سەرەتایی باش» دەخاتە نێو هزرە ئەخلاقییەکەیەوە کە بە پێی ئەوە مرۆڤی سەرەتایی لە لایەنی ئەخلاقییەوە لە مرۆڤی شارستانی باشترە.

بە دەستەواژەیەکی تر، تۆلستۆی بیرۆکەی پەرەسەندنی مرۆڤ لە ڕۆسۆ وەردەگرێت. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان دوو شێوەی بەکارهێنانی ئەم بیرۆکەیە لە لایەن تۆلستۆی پیر و تۆلستۆی گەنجدا. بەڕای تۆلستۆی لاو، پەرەسەندنی ئەخلاقی بەبێ بنەمای ئەقڵانی ناتوانێت بوونی هەبێت. بە بڕوای ئەو، پشت بەستن بە ئەقڵی مرۆڤ باشترین پێوەرە بۆ دۆزینەوەی ڕاستی. بەڵام بەڕای تۆلستۆی پیر، بابەتەکە تەواو پێچەوانەیە. لە سەرەتای ساڵی ١٨٧٠ ئەو بەرەبەرە لە ڕاسیۆنالیزمی

مۆدێرن دوور دەکەوێتەوە و ئەقڵانیەتی مۆدێرن مەحکوم دەکات بەوەی کە ناتوانێت وەڵامی پرسە سەرەکییەکانی بوونی مرۆڤ بداتەوە. بە بۆچوونی تۆلستۆی، زانستی نوێ توانای وەڵامدانەوەی پرسە سەرەکییەکانی نییە، بۆ نموونە ئەوەی کە «بۆچی من دەژیم؟» و یاخود ئایا لە ژیانی مندا، هیچ ئامانجێک هەیە کە لەگەڵ مەرگی نکۆڵی لێنەکراوی مندا لە ناو بچێت؟» تۆلستۆی کە لە دوای قەیرانە رۆحییەکەی، زۆر لە ئەقڵخوازی بێزار دەبێت، خواناسی و زانین لە رێگای باوەڕەوە دەخاتە بەرامبەر راستی زانستی و ئەقڵانییەوە. لە پاش کۆتایی هاتنی قەیرانەکە، پەیوەندی خۆی بە رابردووە دەوڵەمەندەکەی دەپچڕێنێت و وەک پیر بێزۆخۆڤ (Pierre Be zoukhov) لە رۆمانی شەڕ و ئاشتیدا و کۆنستانتین لێڤین (Constantine Levine) لە کتێبی ئانا کارنینا (Anna Kare nine)دا روو لە باوەڕی مەعنەوی دەکات. رۆمان رۆلان (Romain Rol land) دەڵێت: «کۆتایی ئانا کارنینا گێڕانەوەی ژیاننامەی کەسێکە لە گۆڕانی ئەخلاقی کە دوو ساڵ دواتر لە کتێبی دانپێدانانەکاندا بیروڕاکانی خۆی بەیانکردوون.»[٢٩] تۆلستۆی بەم شێوەیە پەیامە ئەخلاقییەکەی بەیان دەکات: خزمەتکردن بە خوا. بەڵام بۆ خزمەتکردن بەخوا پێویستە خزمەت بە هاوچەشنەکانت بکەی، چونکە خوا تەنیا چاوەڕوانی خۆشەویستی و کردەی چاکە دەکات. کەواتە تۆلستۆی لەرێی ئەو کردەوانەی کە لە ئینجیلەکاندا دەیاندۆزێتەوە بەردەوام بانگەشە بۆ پەرستن دەکات. بەم شێوەیە بە بۆچوونی تۆلستۆی، رێنماییەکانی حەزرەتی مەسیح بە بنەمای هەموو کارێکی ئەخلاقی و سیاسی لە قەڵەم دەدرێن. بە بڕوای تۆلستۆی، حەقیقەتی مەسیح تاکە چەکێکە کە رێگە بە مرۆڤ دەدات رێگری پووچی مردن پشتگوێ بخات و لەدژی درۆ و ریاکاریی دەسەڵاتی سیاسی بجەنگێت. بەڵام بە باسکردنی ئەم بابەتە تۆلستۆی ئیلاهییاتی دۆگمایی نوێ لەبەر چاو ناگرێت. بە پێچەوانەوە، دەستپێشخەری بۆ رەخنەیەکی کۆمەڵایەتی نوێ لەسەر



بناغەی باوەڕ دەکات. تۆلستۆی بە گوێڕایەڵی کردن لە حەقیقەتی مەسیح، خەڵکی فێرە بێ میهری سەبارەت بە دەسەڵات دەکات.

کەواتە، دەسەڵاتی سیاسی و هێزی کەنیسە بە جارێک بە ناڕەوا دادەنێت و هەردووکیان بەوە تاوانبار دەکات کە لەرێی خراپە و درۆوە خەڵک بەرەو هەڵدێر دەبەن. بەم شێوەیە بە هەموو هێزیەوە داوا لە مرۆڤەکان دەکات کە سەرەنجام تێبگەن «بەر لەوەی وابەستە بن بە حکوومەتێکەوە وابەستەن بە خواوە و پێویستە هێندەی هاوولاتیەکانیان بێگانەکانیشیان خۆش بوێن.»[٣٠] بۆیە نیشتمانپەروەری لە لا پەسەند نییە، چونکە پێی وایە نیشتمانپەروەری لە جیاتی ئەوەی مرۆڤەکان بکاتە یەک، لە یەکتریان جیا دەکاتەوە. لەبەر ئەوە دەڵێت: «[پەیامی مرۆڤ] بە هیچ شێوەیەک ئەوە نییە کە کاولکاری پێشکەش بە نەتەوەکان بکات، بەڵکو پێویستە لەو ماوە کورتەی کە لەم جیهانەدا دەژین بۆ بەدی هێنانی ئاواتەکانی مرۆڤ هەوڵبدەین.»[٣١] هەروەها تۆلستۆی سەبارەت بە هێزی کەنیسە نەرمی نانوێنێت و کەنیسە بەوە تاوانبار دەکات کە لە جیاتی بڵاوکردنەوەی پەیڤەکانی مەسیح، درۆ و خورافەی ناپەسەند بڵاو دەکاتەوە. داوا لە مرۆڤەکان دەکات جارێکی تر پەیڕەوی لە مەسیحییەت و مەسیحییەکانی بەرێ بکەن. کە ئەو مەسیحییەت و مەسیحییانەش بە هەمان دڵسۆزیی سەرەتاوە لای جووتیارەکانی روسیا دەدۆزێتەوە. بەم شێوەیە داوا لە روسیا دەکات چاکسازیی ئایینی لە جیهاندا بکات و داوایان لێدەکات ئەوەندە بە تەنگ بەرژەوەندییە ماددییەکانیانەوە نەبن و چاو بەرووی ژیانێکی مەعنەوی هەڵبهێنن کە لەسەر بناغەی خۆشەویستی دامەزراوبێت. بە ناوی ئەم ئایدیایەی خۆشەویستییەوەیە کە تۆلستۆی دەکەوێتە لایەنی رکابەری ئایینی کەنیسەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، لە هەوڵی ئەوەدا نییە بیرۆکەی کاری وێرانکەرانە لە دژی کەنیسە بڵاوبکاتەوە. بەڵکو دەیەوێت بە جۆرێک لە جۆرەکان لە رێگەی خۆشەویستی و

ناتوندوتیژییەوە باوەڕی مەسیحی توندوتۆڵ بکات. بە بۆچوونی تۆلستۆی، خۆشەویستی خودی خوایە. بە بڕوای ئەو، بۆ دۆزینەوەی خوا، پێویستە مرۆڤ هاوچەشنی خۆی خۆش بوێت. کەواتە بیرۆکەی ئەوین لای مرۆڤ خۆرسکە، چونکە بە وتەی ئەو «مرۆڤ خۆشەویستی دەکات، چونکە خۆشەویستی جەوهەری ڕۆحە.»[٣٢] تۆلستۆی لە نامەیەکدا بۆ هیندۆسێک (Lettre a un Hindou)، دەچێتە سەر باسی بیرۆکەی ئەوینی سەرتاپاگیر و دەنووسێت: «لە هەر مرۆڤێکدا، بەشێک لەم ڕۆحە گشتییە هەیە کە ژیان بە هەموو بوونەوەران دەبەخشێت. ئەم ڕەگەزە خوازیاری یەککگرتنە لەگەڵ هەر شتێک کە لە لایەنی جەوهەرەوە لێی نزیکە و ئەم ئامانجە لە ئەویندا بەدی دێت. ئەم بۆچوونە بە شێوەیەکی تارادەیەک روون لە سەردەمە جۆراوجۆرەکان و وڵاتە جیاوازەکاندا و بە شێوازی جیاجیا وتراوەتەوە لە ڕێبازی براهمانی، ئاینیی هیندۆسی، ئاییینی مەزدایی و بوودایزم و...»[٣٣] هەموو ئاگادارن لە ڕادەی کاریگەریی ئەم کتێبە لەسەر گاندیی لاو لەو کاتەی لە ئەفریقای باشوور بوو. گاندی لە پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبە، بڕیار دەدات نامەیەک بۆ تۆلستۆی بنووسێت. چاوپێداخشاندنێکی خێرا بە نامەکانی ئەم دووانەدا پێکچوونێکی زاتی لە نێوان یاسنایا پۆلانا(Iasnaia Poliana)ی زاناو گاندی لاو ئاشکرا دەکات. دواتر لە سەدەی بیستەمدا ، گاندی وەک پەیامهێنەری گەورەی ناتوندوتیژی دەناسرێت. لە ساڵی ١٩١٩، تۆلستۆی لە نامەی بانگەوازێک بۆ گاندی دا دەنووسێت: «تا ئەو کاتەی کە زیندووم، بە تایبەتی ئێستا کە زۆر هەست بە نزیکبوونەوەی مەرگ دەکەم، پێم خۆشە قووڵترین هەستەکانم بە ئەوی تر بناسێنم. باسکردنی شتێکە کە گرنگیەکی لە ڕادەبەدەری بۆ من دەبێت، ئەویش ئەوەیە کە بە «بەرەنگارنەبوونەوە»ی ناوزەد دەکەن. لە ڕاستیدا ئەم بەرنگارنەبوونەوەیە شتێک نییە جگە لە فێرکردنی ئەوینی ڕاستەقینە کە بە ڕاڤە درۆزنەکان



دووچاری تەحریف کردن نەبێتەوە... ئەم خۆشەویستییە، کە پێویستیی یەکێتی برادەران و ئەو کەسە چاکانەیە کە ئەم خۆشەویستییەی لێوە سەرهەڵدەدات، بەرزترین یاسای ژیانی مرۆڤە، و هەر بووێکی مرۆیی وەک چۆن لە منداڵاندا دەبینرێت- لە قووڵایی ڕۆحیدا هەستی پێدەکات... هەموو فەیلەسوفە هیندی، چینی، عیبرانی، یۆنانی و ڕۆمانییەکان پاڵپشتی لەم یاسایەی خۆشەویستی دەکەن. بەڵام پێم وایە مەسیح لە هەموویان باشتر دەری بڕیوە، ئەو کاتەی کە دەڵێت: «تەنیا خۆشەویستی هەموو یاسا و پێغەمبەران دەگرێتە خۆی.»[٣٤]

کەواتە بە بۆچوونی تۆلستۆی، یاسای خۆشەویستی جەوهەری بوونی ئێمەیە. چونکە بنچینەی ژیان پیادەکردنی توندوتیژی ئەم تاک نییە بەسەر ئەو تاکەوە، بەڵکو خۆشویستنی هاوچەشنە.

لێرەدا تۆلستۆی ڕێنماییەکانی مەسیح لە بارەی ئەوین بە زمانی خۆی دەڵێتەوە: «ئەو کەسەت خۆشبوێ کە خراپەی لەگەڵ کردووی، ئەو کەسەی کە تۆی مەحکوم دەکرد و خۆشی نەدەویستی خۆشت بوێ؛ ئەو کات هەموو ئەو شتانەی خوا لە ڕۆحی تۆدا شاردبوونیەوە لە ناودەچن و وەک بڵێی لەسەر بەندەرێکی ئاوی سازگار، چەمکی یەزدانیانەی خۆشەویستیی خوا دەبینی.»[٣٥] و لە وەڵامی ئەو کەسانەدا کە پرسیاری لێدەکەن لە بارەی ڕێگاکانی ململانێ لەگەڵ باڵادەستیی حکوومەتدا، دەڵێت: «خۆشەویستی لە خۆماندا پەروەردە بکەین، نەک تەنیا خۆشەویستیی ئەو کەسانەی کە ئێمەیان خۆشدەوێت، بەڵکو خۆشەویستیی هەموو مرۆڤەکان، بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە بەنیسبەت ئێمەوە بێگانەن و ئەو کەسانەی لێمان بێزارن.»[٣٦] لە میانەی ئەم گوتانەی تۆلستۆی تێدەگەین کە ئەو لە ئامۆژگاری سەرچیای مەسیحدا بە دوای ئامانجە شۆڕشگێڕییەکەیدا دەگەڕێت. کەواتە بۆ باشتر ژیان لەگەڵ ئەم ئامانجەدا، تۆلستۆی لە کۆتایی تەمەنیدا بڕیار دەدات واز لە شێوازی ژیانی دەرەبەگایەتی بهێنێت و چیدی

خزمەتی خزمەتکارانی پەسەند نەکات، بە خۆی جلەکانی دەشوات، لە کێڵگەدا کار دەکات و بڕیار دەدات ئیتر مەی نەخواتەوە، خۆی لە تووتن بەدوور بگرێت و گۆشت نەخوات. تاکە ئامانجی خزمەتکردنی مرۆڤەکانە بە گیانێکی چاک و ناتوندوتیژی. واز دێنێت لە چێژە لەشییەکان و ئەو شتە ماددییانەی کە خۆشی دەوێن، تاکو ژیانێکی مەعنەوی پڕ لە خۆشەویستی و ئامادەیی خوا بە دەست بهێنێت. چونکە دەڵێت: «ژیانی راستەقینەی ئێمە بەو شێوەیەی لێرە، لەسەر زەوی دەژین و بەو شێوەیەی کە دەیبینین، تەنیا دەرەکی و جەستەیی نییە، ئێمە ژیانێکی ترمان هەیە سەرەڕای ئەم ژیانە کە دەروونی و رۆحییە.»[٣٧] کەواتە، باس لە یەکێتی لەگەڵ خواو داهێنراوەکانی خوا دەکات. چونکە خوای تۆلستۆی ئەو رەگەزەیە کە یەکێتیی بوونی لە نێو سیستمی جیهاندا هەیە. سەرچاوەی خۆشەویستییە و لە رێگەی ئەوەوە هەموو شتێک دەبێتە خۆشەویستی؛ بە دەستەواژەیەکی تر، خۆشەویستی لە روانگەی تۆلستۆیەوە مەرجی زەروریی بەختەوەریی مرۆڤە. لەو شوێنەی خۆشەویستی هەیە، ژیان هەیە. لە کاتێکدا کە رق وکینە و زەبروزەنگ مایەی کاولکارین. بە بڕوای تۆلستۆی، چەمکی خۆشەویستی شۆڕشگێڕترین پەیامەکە مرۆڤایەتی دەیناسێت.

بە بۆچوونی ئەو، خۆشەویستی سیمبۆلی جیهانی نارازیبوونی ئەخلاقییە لە دژی هەموو جۆرە سەرکوتکردنێکی پایە و پایەی مرۆڤ لە کۆمەڵگای ئەمڕۆدا. تۆلستۆی وێنەی زانستی و ئیستاتیکی شارستانییەتی رۆژئاوا رەتدەکاتەوە. جەخت دەکاتە سەر مانای ئایینیی هونەر. چونکە بە گوتەی ئەو، هونەری راستەقینە هەمیشە لە خزمەتی هوشیاری ئایینیدا بووە. کەواتە ئەگەر ئامانجی هۆشیاری ئایینی بەرزکردنی ئەخلاقی مرۆیی و یەکێتیی گشتی «بە شێوەی برایەتییەکی گەورەی خۆشەویستی» بێت، هەروەها هەوڵی هونەری راستەقینە دەربڕینی بەرزترین هەستەکانە بە شێوەیەک کە «ئامرازی یەکێتیی نێوان مرۆڤەکان»



بێت. تۆلستۆی دەنووسێت: «ئیدی ئامانجی هونەری داهاتوو باسکردنی ئەو هەستانە نییە کە تەنیا هەندێک لە دەوڵەمەندان بتوانن بە دەستی بێنن، [بەڵکو] مەبەستەکەی دیار خستنی بەرزترین هۆشیاریی ئایینیی نەوەکانی داهاتوویە.»[٣٨]

سەرەنجام تۆلستۆی لە تەسکەڕێی بزاڤی عیرفانی و لە ترسی ونکردنی خوا، گۆشەی تەنیایی دەگرێت. لە ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩١٠، واز لە زەویە فیودالیەکانی دەهێنێت تاکو پەنا بۆ نەوسک (خەڵوەتخانە)ی ئۆپتینا (Optina) ببات. بەڵام لە شەمەندەفەردا نەخۆش دەکەوێت و لە سالۆنی وێستگەی بچووکی ئاستاپۆڤۆ (Astapovo) دایدەنێن. لە حەوتی کانوونی یەکەمی ١٩١٠ پێش ئەوەی لە کاتژمێر شەشی بەیانی کۆچی دوایی بکات، دوایین وشەی بە زماندا هات: «راستی... زۆرم خۆشدەوێ.»

چەند ساڵێک دواتر رومن رۆلان بە «رۆحی گەورەی روسیا»[٣٩] وەسفی دەکات و ماهاتما گاندی نازناوی «گەورە پێغەمبەری بەرەنگارنەبوونەوە لە بەرامبەر خراپە»ی[٤٠] لێدەنێت. بێگومان تۆلستۆی کاریگەری جۆراوجۆری لەسەر مێژووی سەدەی بیستەم بەجێهێشت. لەگەڵ ئەوەشدا، پەیامی جیهانی ناتوندوتیژی ناتوانێت گوتە بێژێکی باشتری لە ماهاتما گاندیی هەبێت.

## ماهاتما گاندی

### پەیامهێنەری لێبوردەیی

ماهاتما گاندی یەکێک بوو لەو مرۆڤە دەگمەنانەی کە هەم تیۆریستی لێبوردەیی (تۆڵەرانس) بوو و هەمیش لێبوردەیی پراکتیزە کرد. گاندی لە دڵەوە باوەڕی بەوە هەبوو کە لێبوردەیی (تسامح) نە تەنیا یەکێکە لە ڕێگە چارەکانی سەدەکەی، بەڵکو ڕێگە چارەی سەدەکانی داهاتووشە. هەر لەبەر ئەوە بیر و هزرەکانی گاندی لەمەڕ لێبوردەیی و ناتوندوتیژی لە سنووری مێژووی نوێی هیندستان تێدەپەڕن، هەرچەندە لە سەرەتادا مەسەلەی سەربەخۆیی هیندۆستان ئایندەکەی بە جۆرێک لە جۆرەکان لەبەر چاوی بوون. قسەیەکی هەر ئاواهی نییە کە بڵێین ئەگەر گاندی هیندی نەبوایە هەرگیز نەدەبووە گاندی. ئەو خاڵە جێگەی بڕوا پێکردنە کە هزری لێبوردەیی گاندی ڕەگی لە کولتووری هیندی دایە.

لەگەڵ هەمموو ئەمەدا گاندی، لە سەرەتادا بە هۆشیارییەکی بەهێزەوە، کولتووری هیند و خاڵە بەهێز و لاوازەکانی ئەو کولتوورەی هەڵسەنگاندن و بۆ برەودان بە هزری لێبوردەیی و ناتوندوتیژی خۆی لە کولتوورەکانی تردا بە دوای ئەو خاڵانەدا گەڕا کە دەکرێ پشتیان پێ ببەستێت.

لە ناوهێنانی ئەو کەسایەتییانەی کە کاریگەری بەرچاویان لەسەری هەیە، بێگومان لیۆ تۆلستۆی پایەی یەکەمی بەدەست هێناوە. نامە گۆڕینەوەکانی ئەو دووانە بە یەکەمین نامەی گاندی بۆ تۆلستۆی لە ڕێکەوتی یەکی ئۆکتۆبەری ۱۹۰۹، لە پاش خوێندنەوەی کتێبی *قەڵەمڕەوی خوا لەناو ئێمە دایە* (Le Royaume de Dieu est en vous) دەستی پێکرد و تا مردنی تۆلستۆی بەردەوام بوو؛ و لەم نامانەدا بیروڕایان



لەمەڕ دوو کێشەی گرنگی ناتوندوتیژی و خۆشەویستی گۆڕییەوە.

تۆلستۆی دەنووسێت: «لە ڕاستیدا، ئەم ناتوندوتیژییە شتێک نییە جگە لە فێرکردنی خۆشەویستیی ڕاستەقینە کە بەراڤە درۆیینەکان دووچاری تەحریف نەبێت. خۆشەویستی واتە حەزکردن لە هەماهەنگیی ڕۆحیی مرۆڤەکان، و ئەو کردەیەی کە لەم حەزەوە بە دەست دێت، یاسای باشتری ژیانی مرۆییە. هەر بوویێکی مرۆیی- وەک چۆن لە منداڵاندا دەبینرێت- لە قووڵایی بوونیدا هەستی پێدەکات. هەمموو مرۆڤێک ئەوە دەزانێت تا ئەو کاتەی کە درۆی ڕێنماییە دنیاییەکان بۆ چوونەکانی پەریشان بکەن هەمموو فەیلەسووفە هیندی، چینی، عیبری، یۆنانی و ڕۆمانییەکان پشتگیریان لەم یاسایەی ئەوین کردووە. بەڵام پێم وایە مەسیح لە هەمموویان باشتر ڕوونی کردۆتەوە، ئەو کاتەی کە دەڵێت: «تەنیا خۆشەویستییە هەمموو یاساو پێغەمبەرەکان لە خۆ دەگرێت.»[٤١]

کتێبی تۆلستۆی گاندی هوشیار کرد و بە ئاگاهێنایەوە. هەروەها بووە پایەیەکی پتەو بۆ دووبارە ڕاڤەکردنەوەی بهگود-گیتا و ئینجیلەکان (بە تایبەتی ئامۆژگاریی سەر چیا). بۆیە لە ساڵی ۱۹۳۲، دەڵێت: «تۆلستۆی باوەڕی منی سەبارەت بەوەی کە تەنیا مەعریفەیەکی لێڵم لە بارەیەوە هەیە، بەهێز کرد.. من لەسەر بنچینەیەک کە تۆلستۆی دایمەزراندبوو دەستم بەکار کرد. و وەک قوتابییەکی باش، ئەوەی بە میرات بۆم مابوویەوە پەرەم پێدا.»[٤٢]

بەم شێوەیە بیرۆکەی خۆشەویستی، وەکو یەکێک لە بنەما بنچینەییەکانی ئایینی حەزرەتی مەسیح و فەلسەفەی تۆلستۆی، بوو بە تەوەری ناوەندی هزری لێبوردەیی گاندی. پێویست بوو ئەم کاریگەرییە یارمەتی گاندی بدات تا بیرۆکەی «خوا- ڕاستی»ی خۆی باشتر ڕێکبخات.

لە حوزیرانی ۱۹۳۲، گاندی لە لۆزان لە وتووێژێکدا لەگەڵ پییێر

سێرزۆل (Pierre Ceresole)دا دەڵێت: «من هاوباوەڕم لەگەڵ ئەوانەی دەڵێن خوا خۆشەویستییە. لە قووڵایی دڵمدا، خۆشەویستی و راستی هەیە.»(٤٣)

خۆشەویستی و راستی دوو ئایدیای دایکن لە هزری ناتوندوتیژی گاندیدا، هەم جیاوازن لە یەکتر و هەمیش تەواوکەری یەکترن. راستی سیمبۆلی مەبەستێکە کە پێویستە لە ژیاندا پێی بگەین. بەم پێیەش بۆ زانینی راستی جگە لە ئەوین رێگایەکی تر نییە. چونکە «ئەو کەسەی کە باوەڕی بە راستی و ناتوندوتیژی هەیە، پڕە لە هیوا، هیوا بەدیهێنەری خۆشەویستییە و خۆشەویستیش دەبێتە هۆی دلێری و باوەڕ.»(٤٤)

کەواتە ئەزموونی حەقیقەت لە لای گاندی وەک هۆکاری خۆشەویستی و لێبوردەیی دەردەکەوێت، ئەم ئەزموونە هاوکاتە لەگەڵ رەتکردنی گشت جۆرە بانگەشەیەکی راستیی رەها. لەم رێچکەیەوە، ئەو ئایدیا سادە و سروشتییە دەخرێتەڕوو کە راستی لە لای هەر یەکێک لە ئێمە بە شێوەیەکی جیاواز دەردەکەوێت. کەواتە بەبێ لێبوردەیی سەبارەت بە راستیی ئەوی دیکە ناتوانین لە راستیی گشتی نزیک ببینەوە. گاندی دەنووسێت: «پرەنسیپی زێڕین، لێبوردەیی بەرامبەرە. چونکە هەرگیز بیروباوەڕەکانی هەموومان وەکو یەک نین و هەمیشە تەنیا بەشێکی راستی لە گۆشەی جیاوازەوە دەبینین.»(٤٥)

بە دەستەواژەیەکی تر، ئەگەر گەڕان بە دوای راستی هۆکاری سەرەکی بێت لە ژیانی رۆحی مرۆڤەکاندا، هەموو کەسێک بۆی هەیە شێوازی خۆی هەڵبژێرێت. گرتنەبەری رێگا جیاوازەکان چ گرنگیەکی هەیە لە کاتێکدا مەبەستی هەموومان یەکە. ئەنجامی لۆجیکی و راستەوخۆی ئەو هزرە ئەوەی کە هەموو ئایینەکان سەرچاوەیەکی وەکو یەکیان هەیە.

کەواتە لەگەڵ یەکدا یەکسانن. گاندی دەنووسێت: «پێم وایە تەنیا ئایینێک لە جیهاندا هەیە، تەنیا ئایینێک، و هەروەها لەو بڕوایەدام کە



ئەو ئایینە درەختێکی گەورەیە و لق و چڵی زۆرن.... و بەهەمان شێوەی کە لقەکان رەگەکانیان لە تاکە سەرچاوەیەک وەردەگرن، هەموو ئایینەکانیش جەوهەری خۆیان لە هەمان ئەو کانیاوە وەردەگرن کە سەرچاوەیە. بنچینەی ئایین یەکە، چونکە خوا یەکە. خواش کە گشتێکی تەواوە، ناشێ زۆر لقی هەبن، بەڵکو نە بەشبەش دەبێت و نە وەسف دەکرێت. لە ئەنجامدا بێ زیادەڕەوی دەتوانین بڵێین خوا هێندەی مرۆڤەکانی سەرزەوی ناوی هەیە. ئەو ناوەی لێی دەنێین، هێندە گرنگ نییە. ئەو یەکە و نابێ بەدوو.»(٤٦)

گاندی داوامان لێدەکات هێندەی کە رێز لە بیروباوەڕەکانمان دەگرین، رێز لە بیروباوەڕەکانی ئەوی دیکەش بگرین، چونکە بەبێ ئەم «ئازادیخوازییە» ناتوانین بەدوای ئازادیدا بگەڕێین. لەبەر ئەوەی کە هێشتا بە دوای راستیەوەین، کەواتە هێشتا بە شێوەیەکی تەواو ئەومان نەدۆزیوەتەوە و پێویستە لە کەموکووڕییەکانی بیروباوەڕەکانمان ئاگادار بین. بەم شێوەیە، لە هەمان کاتدا کە رێز لە بیروباوەڕەکانی ئەوی تر دەگرین، نابێت سستی لە باوەڕەکانماندا بکەین و بایەخیان پێ نەدەین. رەوشتی لێبوردەییانەی گاندی سەبارەت بە مەسیحیەت، یەهودیەت و ئیسلام بە هیچ شێوەیەک نەبۆتە لەمپەر لە بەرامبەر پابەندبوونی بە رێنماییەکانی ئایینی هیندۆسییەوە. لە ٢٠ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٧، لە وتارێکدا لە بڵاوکراوەی هیندی لاو (Young India)دا دەنووسێت: «... بە پێی تاقیکردنەوەی شەخسیم، ئایینی هیندۆسی لێبوردەترین و بە تەحەمولترین ئایینە... ئایینێکی تایبەتی نییە بەو کەسانەی کە باوەڕیان پێی هەیە ئەو توانایە دەبەخشێت کە نە تەنها رێز لە ئایینەکانی تر بگرن، بەڵکو ئەو چاکیانەی کە لە ئایینەکانی تردا هەن بگرێتە خۆ و دەست خۆشییان لێبکات. ناتوندوتیژی لە هەموو ئایینێکدا هەیە، بەڵام باشترین شێوەی بەیانکردن و گرتنەبەری لە ئایینی هیندۆسیدا دەبینرێت.»(٤٧)

هەموو ئایینەکانی جیهان لەسەر راستین، بەڵام تەنیا خوا کامڵە .
گاندی پێمان دەڵێت کە مرۆڤ بە پەروەردەکردنی لێبوردەیی لە خۆیدا سەبارەت بە بیروباوەڕەکانی تر، دەتوانێت باوەڕەکانی خۆی کامڵ بکات. «لێبوردەیی توانای نفوزی رۆحیمان پێ دەبەخشێت کە بە دووری جەمسەری باکوور لە جەمسەری باشوور لە دەمارگیری دووره.»[٤٨] لێرەدا گاندی تیۆری لێبوردەیی هیندی بە هەمان شێوەی کە لە بەرهەمە گەورەکانی ئایینی وەک ریگ-ڤیدادا هەیە لە زمانی خۆی دەگێڕێتەوە: ئەو ناوی ئیندرا، میترا، ڤارونا، ئاگنییە... راستییەکە، تەنانەت ئەگەر بە ناوی جیاجیاش بناسرێت.»[٤٩] بهەگەڤاد- گیتاش ئەو بابەتە بە ئاشکرا بەیان دەکات: «تەنانەت ئەوانەی رێز لە خوایەکانی تریش دەگرن، لەبەر خۆشەویستییەکەیان بۆیان رێز لە ئێمەش دەگرن...»[٥٠]

کەواتە هزری لێبوردەیی لە لای گاندی بەرهەمی نەریتی تەمەن درێژی فرە ئایینیە لە هیندستاندا کە هەر لە سەردەمی ئاشوکاوە تا سەدەی بیستەم بەردەوام بووە و هەروەها سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەکبەر شاش دەگرێتەوە. کەواتە نەریتێکی تەواو ئایدیالیزمیانە نییە، چونکە ئەزموونە دنیاییەکان پشتگیریان لێ کردووە. گاندیش لە میانەی فێربوونی جەینیزم لە قۆناغی منداڵیدا لەو تاقیکردنەوەیە بەهرەمەند بووە. بەڵام گاندی لە دەسپێکی تاقیکردنەوەکەدا لە ئەفریقای باشوور رووبەڕووی مەسەلەیەک دەبێتەوە کە زیاتر لە جاران بەرەو هزری لێبوردەیی پەلکێشی دەکات. ئەو مەسەلەیە هەمان یەکێتی نێوان موسڵمان و هیندۆسەکانە. لە وتارێکدا لە رێکەوتی ٢٦ی ئابی ١٩٠٥ کە لە بڵاوکراوەی بیروڕای هیندیەکان (Indian Opinion)دا چاپ بوو، گاندی باس لە خواستی بۆ یەکێتی دەکات: «لە راستیدا دروستبوونی پەیوەندیی نێوان موسڵمان و هیندیەکان پێویستی بە لێبوردەیی گەلێ زۆر هەیە. هەندێ کات ئەو هزرە دێتە پێشەوە کە دووری نێوان ئەو دوو کۆمەڵگا ئایینییە لە دووریی نێوان



رۆژهەڵات و رۆژئاوا زیاترە.»[٥١]

لە هەموو حاڵەتێکدا، گاندی لە بارەی دژوارییی ئەو مەسەلەیە هەرگیز تووشی خەیاڵپلاو نەبوو. ئەو وەکو پەیڕەوێکی ئایینی هیندۆسی تا ئەو شوێنەی کە دەکرا بووە دوستی موسڵمانان و تەنانەت تا ئەو شوێنە چووە پێشەوە کە داوا لە پەیڕەوەکانی تری ئایینی هیندۆسی بکات خۆیان فێرە زمانی ئوردو بکەن تا بتوانن باشتر لەگەڵ موسڵمانەکانی هیندستان پەیوەندی بەرقەرار بکەن. کەواتە تەوەری ناوەندیی کولتووری لێبوردەیی گاندی، کاری خۆبەدوورگرتنی ئەوە لە توندوتیژی لە ماوەی شەڕە خوێناوییەکانی نێوان هیندۆس و موسڵمانەکان.

گاندی، هۆشیارانە لە ئەرکە هەرە مەترسیدارەکەی، بە هەموو توانایەکەوە، شێوازی ناتوندوتیژی دەگرێتەبەر. زۆرمان دەگرێت تا کۆتایی بە پێکدادانی نێوان دوو کۆمەڵگاکە بهێنێت.

ئەو دەنووسێت: «ئەزموونەکانم لە ئەفریقای باشوور پشت راستیان کردم کە مەسەلەی یەکێتی نێوان هیندۆس و موسڵمانەکان کە ahimsa (بیرۆکەی ناتوندوتیژی)ەکەم بە توندی دەخاتە بەر تاقیکردنەوەوە، و ئەم مەسەلەیە فراوانترین بوار بۆ ئەزموونەکانم لەمەڕ ahimsa دەرەخسێنێت.»[٥٢]

لە ٣٠ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٨، گاندی کە تازە بە تازە گەڕێکی تری مانگرتن بە مەبەستی هێورکردنەوەی رەفتاری هیندۆسەکان لەگەڵ موسڵمانەکان بە کۆتایی گەیاندبوو کە بە دەستی لاوێکی دەمارگیری هیندۆسی کوژرا کە پەیڤەکانی گاندیی بۆ پاشەڕۆژی هیند بە مەترسیدار دەزانین. گاندی پێش مردن، بواری بۆ رەخسا لە بکوژەکەی بڕوانێت و پەنا بۆ ناوی رام ببات، هەروەها بە بیرۆکەی لێبوردەیی رێز لە بکوژەکەی بگرێت. حەقیقەتی گاندی و هەموو هیوای ئێمە بە دوارۆژێکی باشتر لە نێو ئەم دوا جووڵەی گاندیدا شوێنی دەبێتەوە.

بێگومان هەر لە سەردەمی سوقرات و حەزرەتی مەسیحەوە، ناتوندوتیژی پشتیوانیکەرێکی دیارتر لە گاندیی نەبووە. بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە تەنیا چەند کەسانێکی کەم وەکو ئەو بوونە، گاندی یەکێکە لەو کەسانەی کە لە رزگارکردنمان لە زەبروزەنگ پشکێکی هەرە سەرەکیی هەیە. بۆ جیهانی ئێمە کە توندوتیژی تیایدا شتێکی سەرتاپاگیرە، رێنماییەکانی گاندی هەمیشە بە نرخن.

ئەمڕۆ ناتوندوتیژی لە شێوازە گاندییەکەیدا، توانایەکی زۆری هەیە، بۆ ئەوەی پەیوەندی بپچڕێنێت لەگەڵ ئەو نەریتانەی بیرکردنەوە کە بێ توانان لە چارەسەرکردنی جیاوازی نێوان ئەخلاق و سیاسەت. چونکە ئەخلاق و سیاسەت رەهەندی واقعی خۆیان تەنیا لە پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤدا دەدۆزنەوە. ناتوندوتیژی هەمیشە داوای خەبات دەکات لە دژی زۆردارێک کە حوکم بەسەر تاکەکانەوە دەکات. بەم شێوەیە پێویستە مرۆڤ لە هەوڵ و کۆششیدا بۆ باشتر رێکخستنی شارستانیەت ناتوندوتیژی بگرێتەبەر.

بەرگریکردن لە مرۆڤایەتی لە بەرامبەر خواستی ئەو بۆ وێرانکاری: ئەمەپەیامی ئەو کەسەیە کە شاعیری هیندی، رابیندرانات تاگور، نازناوی ماهاتما (گیانی گەورە)ی لێنا. بێگومان گاندی مرۆڤی سەردەمی ئێمەیە، ئەو مرۆڤەی کە بە باشی لە لایەنی تراژیدیی چارەنووسی مرۆڤ تێگەیشتووە، کە هەزاران ساڵە توندوتیژی ریشەی تیادا داکوتاوە. گەشبینی ئەو لە سنووری هەوڵە مێژووییەکەیدایە بۆ زاڵبوون بەسەر توندوتیژیدا، و لەسەر پایەی بنەما ئەخلاقییەکانی ئەو راوەستاوە کە دەڵێت: «من بە تەواوی لە کەموکورییەکانی مرۆڤ کە خۆشم یەکێکم لەوان، ئاگادارم تاکو لەهیچ کەس لە هاوجۆرەکانم تووڕە نەبم. بەهەمان شێوەی کە نامەوێت لەو هەڵانەی کە بەهۆیانەوە بە بەردەوامی خۆم سەرزەنشت دەکەم رەنج بکێشم، هەروەها لەو کاتەی کە باسی ئەوانی تر دەکرێت ئامادەم بە دوای خراپەدا بچم لە هەر کوێیەک بێت، بەبێ ئەوەی



ئەو کەسە ئازار بدەم کە بەرپرسە لێی... ئەو کاتەی کە بتوانم بچووکترین خراپە نەکەم و خۆم رزگار بکەم لە هەر جۆرە هزرێکی خۆپەرستانە یاخود توندوتیژ، هەرچەند کاتیش بێت، ئەو کات، و تەنیا لەو کاتەدا، دلڕەقترین مرۆڤەکان لە ناتوندوتیژی من دشلەژێن.»[٥٣]

بەم شێوەیە، کاری بێ کەم و کاسی، بەڵام ناتەواوی گاندی، پێویستە لە رەوشە مێژووییەکەماندا، ناچارمان بکات پەیڕەوی لە ئەزموونە ناتوندوتیژییەکەی بکەین تا بە دوای رێگایەکدا بگەڕێین بۆ داهاتووی مرۆڤ، دەنا وەک رۆمن رۆلان پێشتر وتوویەتی: «ئەگەر ئەم هیوایە لە ناوچوو، ئەوەی دەمێنێتەوە تەنیا پێکدادانە زۆر درندەکانن.»[٥٤]

## مارتین لۆتەر کینگ و

## داواکردنی ناتوندوتیژی

«زەبروزەنگ نائەخلاقییە، چونکە بە نەفرەت پەروەردە دەبێت، نەک بە خۆشەویستی. توندوتیژی کۆمەڵگا وێران دەکا و برایەتی ناهێڵێ. لە جیاتی ئەوەی کۆمەڵگا بۆ وتووێژ ڕێنمایی بکات لە وتووێژی یەکلایەنەدا گیری پێدەخوات. هەروەها توندوتیژی خۆیشی سەرەنجام بە سەرکەوتن ناگات، تاڵی بەو کەسانە دەبەخشێت کە ماونەتەوە و خووی دڕندەییش بە سەرکەوتووەکان.»

**مارتین لۆتەر کینگ**

پاش تێپەڕینی سی ساڵ بەسەر کوشتنی «مارتین لۆتەر کینگ» (Martin Luther King) لە چواری نیسانی **١٩٦٨** لەسەر باڵکونی لۆڕان موتێل (Lorrain Motel) لە مەمفیس؛ کە هێشتا ئەو کەسایەتییەکی زۆر گرنگە لە خەباتکردن لە پێناو ناتوندوتیژی لە سەدەی بیستەمدا. هەندێ کەس وەک قەدیس و ڕزگارکەر ستایشی دەکەن و پەیڕەوییان لێکردووە. کۆمەڵێکی تر کە بە تاکێکی ئانارشی و تێکدەری دایدەنێن، لێی بێزارن. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا لە ساڵی ١٩٨٦، کینگ لە تەنیشت جۆرج واشنتۆن و ئەبرەهام لینکۆلن لە گۆڕستانی ناودارانی ئەمریکا نێژراوە. لە پاش ئەوە هەموو ساڵێک بەرێزەوە یادی ئەو لە ١٥ی کانوونی دووەم، ساڵڕۆژی لە دایکبوونەکەی دەکەن. لە پاش مردن بە «گاندیی ڕەش» ناسرا و سالانێکە بووەتە جێگەی ڕێزێکی زۆر و بابەتی باسی جۆراوجۆر. لە ساڵی ١٩٦٤، خەڵاتی نۆبلی ئاشتی پێدرا و ئەمەش ناوبانگێکی جیهانیی گەورەی پێ بەخشی. بەڵام لە هەمان کاتدا ج. ئێدگار هۆڤەر (J. Edgar Hoover)، سەرۆکی ئێف بێ ئای (F. B. I.)، ئەوی بە «خایین بە میللەت و نەژادی خۆی» لە قەڵەمدا، کینگ بە تاوانی گەڕۆکی،



ئیختیلاس و فێڵبازی **٢٩** جار کەوتە زیندانەوە. جارێکیش تا ڕادەی مردن بریندار بوو و دوو جاریش خانووەکەیان تەقاندەوە. ئەم هەموو ڕووداوانە نیشاندەری دەوڵەمەندیی مێژوویی کەسایەتی ئەون، بەڵام بۆ دەرککردنی چەمکی دەروەستەیی (ئیلتزام)یەکەی بەس نین. ئەو پرسیارە سەرەکییەی کە پێویستە بخرێتەڕوو ئەوەیە: بۆچی کینگ ناتوندوتیژیی وەکو شێوازێکی ژیان و ستراتیژیەتێک بۆ ڕێکخستنی سیاسی هەڵبژارد؟

ناتوندوتیژی خاڵێکی پێویستی دەرخستنی هزری فەلسەفی-خواناسیی کینگە. لەم ڕوانگەیەوە، کینگ پێش هەموو شتێک وتارخوێنێکی باپتیستە لە خێزانێکدا کە وتارخوێنی باپتیست بوون. ئەو خۆی بەو کەلەپوورە دەناسێتەوە و لە ساڵی **١٩٦٥**دا دەڵێت: «لە دیدی کەسانێکی زۆرەوە، من ڕوخسارگەلێکی جۆراوجۆرم هەیە: لە بواری مافی مەدەنیدا، بەرپرسم، تێکدەر، ئەخلاقگەرا و وتارخوێنم، بەڵام لە ناخی خۆمدا، لە بنەڕەتدا من خزمەتکاری کەنیسەم. وتارخوێنی باپتیستم. لە هەمان کاتدا ئەمە بوونی من و میراتی منە، چونکە من کوڕ، نەوە و بەرهەمی وتارخوێنێکی باپتیستم.»[٥٥] دوو ساڵ دواتر، دەگەڕێتەوە سەر هەمان بابەت و دەڵێت: «بەر لەوەی من ڕابەری بزاڤی پاراستنی مافی مەدەنی بم، وتارخوێنی ئینجیل بوومە. ئەمە یەکەمین حەزی من بووە و هەمیشەش ئیلتیزامی سەرەکی من دەبێت.»[٥٦] کەواتە بیرکردنەوە و کردەوەکانی کینگ لە وتەکانی ئینجیلەوە سەرچاوە دەگرن. و ئێمە هەمیشە شایەدی باوەڕی قووڵی کینگ-ین بە خواو پەیامی حەزرەتی عیسای مەسیح، بەم شێوەیە بە بۆچوونی لۆتەر کینگ خوا مانا بە کردەی مێژوویی مرۆڤەکان دەبەخشێت.

جەخت کردنی کینگ لەسەر پەیوەندیی سەرەکیی نێوان ئیلتیزامی مرۆڤ و ویستی خوایی، تەوەری سەرەکی خۆی لە ڕووخساری دیاری حەزرەتی مەسیحدا دەدۆزێتەوە. لە ڕاستیدا، کینگ بە پشت بەستنی بە





کەسایەتی مەسیح لە توانایدا دەبێت بنەما ئەخلاقییەکانی خۆبەدوورگرتن لە توندوتیــــژی بڵاو بکاتەوە. بە بۆچوونی هەندێ لە راڤــەکــــەرانی بەرهەمەکانی کینگ، ئەوە بەو مانایەیە کە: «مەسیح ماناو ئامانج بەو دەبەخشێت و گاندیش میتۆد.»[٥٧] کینگ لە زستانی ساڵی ١٩٦٨، لەو بارەیەوە دەڵێت: «لە راستیدا، عیسای مەسیح یەکەمین کاریگەریی قووڵی لەسەر من، وەک قەشەیەک هەیە... لە کاتێکدا کە ماهاتما گاندی ئەو کەسەیە کە زیاتر لە هەموویان لە لایەنی پراکتیکی و میتۆدەکانی جێبەجێکردن بۆ کارکردن لە ژیانمدا کاری تێکردم، چونکە بە کردەوە مەسیحیەتی پێشکەش کردم.»[٥٨] کەواتە، مارتین لۆتەر کینگ سەرچاوەی ناتوندوتیژییەکەی لە گوتە و کردەکانی حەزرەتی مەسیح و گاندیدا دەدۆزێتەوە. کەواتە بە بۆچوونی کینگ، مانا و تایبەتمەندیی حەزرەتی مەسیح لە رەنگی پێستیدا نییە، بەڵکو لە شێوازی ئەنجامدانی خزمەتەکەی بە ویستی خوایی دایە. بە مانایەکی تر، بە بۆچوونی کینگ، مەسیح بە سپاردنی ویستی خۆی بە مەشییەتی خوایی، سەرپێچی لە یاسا نادادوەرەکانی مرۆڤ دەکات. کینگیش بە هەمان نییەتەوە، پروپاگەندەی سەرپێچیکردنی مەدەنی لە یاساکانی ئاپارتاید لە ویلایەتەکانی باشووری ئەمریکا دەکات. کەواتە، حەزرەتی عیسای مەسیح لە دیدی کینگەوە سیمبۆڵی خۆشەویستی و دادپەروەرییە کە بە خاچ دەناسرێتەوە. بە وتەی خۆی: «خاچ بۆ من تەنیا یەک شت، سوێندی کارەساتی شێت ئاسایانە نییە لە مێژوودا، بەڵکو دووربینیی ئەو ئەستێرانەیە کە لە میانەیانەوە دەتوانین بە وردی لە ئەبەدییەت بکۆڵینەوە و ببینین کە خۆشەویستی لە مێژوودا رێگایەک دەکاتەوە.»[٥٩]

کەواتە لەلای کینگ، خاچ خۆشەویستیی مەسیح لە بەرامبەر گوناهەکانی مرۆڤدا بۆ ئێمە ئاشکرا دەکات، هەروەها نیشاندەری ئیسلاحی مرۆڤایەتییەکە کە خوا نەفرەتی لێکردووە. خاچ بەهۆی نەهێنیی



رەنجی مەسیحەوە، هەم بێ مانایی زەبروزەنگی مرۆڤەکان و هەم مانای ئومێد ئاشکرا دەکات. کینگ لەرێی بەدەست هێنانی ئەم هیوایەوە روئیای ئازادبوونی رەشە ئەمریکیەکان دادەرێژێت. بەم شێوەیە کینگ بە پشت بەستن بە هزری مەسیحیناسی، بزاڤی رەشپێستە ئەمریکییەکان راڤە دەکات و دەڵێت: «ئەم باوەڕ بە مەسیحیبوونە ساتێکە لە مێژوو، چونکە بە بڕوای ئێمە داوا لە نەژادی رەش کراوە تاکو ویژدانی بێداری نەتەوەکەمان بێت، و لەم رووەوە توانای ئەوە بە میللەت دەدات تا لە ژێر چاودێریی پەروەردگار و بە تەکلیفی خۆی لە مێژوودا کاربکات»[٦٠]. بە دەستەواژەیەکی تر، رووداوە جۆراوجۆرەکانی بزاڤی مافی مەدەنی لە ساڵەکانی ١٩٥٠ و١٩٦٠ لە ولاتە یەکگرتووەکان (وەکو قەدەغە کردنی ئوتوبوس لە ساڵی ١٩٥٦ لە مۆنتگمری، خۆپیشاندانی ساڵی ١٩٦٣ لە بیرمنگام، رێپێوانی واشنتۆن لە ساڵی ١٩٦٣ و تد...) بە بۆچوونی کینگ، مانای قووڵی خۆیان تەنیا لە دووبارە خوێندنەوەی ئینجیل لە مێژوودا دەبیننەوە. بۆیە، دەڵێت: خوا یا Kairos ی پیرۆز ئێمەی پەسەند کردووە. تەنیا وەڵامی ئێمە بۆ ئەو دەکرێ وەڵامی مارتین لۆتەر بێت: «من لێرەم، ئەی پەروەردگار، هیچ کارێکم پێ ناکرێ، بە هانامەوە وەرە.»[٦١]

بەم جۆرە، بە بۆچوونی کینگ، لەبەر ئەوەی خەڵکی زەحمەتکێش بێدارن، خواش بەهۆی رۆحەکەیەوە لەوێ ئامادەیە. کەواتە بە بڕوای کینگ، شەڕی رەشپێستەکان لە پێناو ئازادی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی شەڕی خوداشە، چونکە: «تا ئەو کاتەی کە خۆشەویستی هەیە، خوا هەیە، تا ئەو کاتەی کە دادپەروەری هەیە، خوا هەیە.»[٦٢] کەواتە کینگ دان بە کاریگەریی خوا لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دەنێت. لەم بوارەدا، کاریگەریی خوێندنەوەی دیاردەناسیی رۆح (La Ph nom nologie de L Esprit) بەرهەمی هیگڵ، لە ماوەی خوێندنی لە زانکۆی بۆستن، بە تەواوی دیارە. لە لایەکی ترەوە، کینگ کە زۆر بەتوندی لەژێر کاریگەریی بزاڤی خودای

مرۆیی (پرسونالیست) ئەمریکیی هارۆلد دی وۆلف (Harold de Wolf) و ئێدگار برایتمان (Edgar Brightman)دایە، لەکتێبەکەیدا بەناوی جەنگ لە پێناو ئازادی ( Combat Pour la Libert)دا، دەنووسێت: «ئەم ئایدیالیزمە پرسونالیستە هەمیشە شێوازی فەلسەفی من دەبێت. بە جەخت کردن لەسەر ئەوەی کە لە راڤەی کۆتاییدا، تەنیا ئەو پرسونالیستە (بێ سنوور یاخود بێ کۆتا)یە راستیی هەیە، پرسونالیزم دوو باوەڕم تیادا بەهێز دەکات: بنچینەی میتافیزیکی و خواناسیم بۆ دابین دەکات تا ڕێز لە پایەی هەموو تاکێکی مرۆیی بگرم.»[٦٣] کەواتە، بە بۆچوونی کینگ، خوا زاتێکی هۆشیارە کە بەڕێوەبردنی جیهانی لە ئەستۆیە و بە خۆشەویستی خۆی دونیا دروست دەکات. کەواتە خۆشەویستی سروشتی سەرەکیی خوا دەردەخات و درێژەی پێدەدات: «ئەو نەک تەنیا هەموویانی بەگشتی خۆشدەوێن، بەڵکو ئێمەی تاکە تاکە و هەروەها جیاو بە تایبەتی خۆشدەوێ.»[٦٤]

کینگ لەم سەرچاوە باوکانە یەزدانیییەدا بە دوای سەرچاوەکانی برایەتیی مرۆییدا دەگەڕێت. ئەم برایەتییە تێکەڵە بە زاتی مرۆڤ، چونکە مرۆڤەکان هەموویان «منداڵی خوان». بەم پێیەش بمانەوێ و نەمانەوێ داوامان لێکراوە بۆ هاوکاریکردن. کەواتە رەتکردنەوەی ئەوی تر، رەتکردنەوەی خوایە. بۆیە، کینگ راسیزم بە ئەوپەڕی خۆپەرستی لە بەرامبەر خوادا دادەنێت ئەو دەڵێت: «راسیزم بڕواییێکە، جۆرە بت پەرستیەکە... دوا لۆجیک کۆمەڵ کوژییە و لەم رووەوە نیشانەی ئەوپەڕی خۆپەرستییە، بەو مانایەی کە خوا لە ئەفراندنەکەیدا هەڵەی کردووە.»[٦٥]

کەواتە نەژادپەرستی دژی یاسای خۆشەویستییە کە خوا پێمانی بەخشیوە. بەم پێیەش پێویستە یاسای راسیزم لە پێناو یاسای خۆشەویستی پێشێل بکەین. لێرەدا کینگ بە جیاوازی کردن لە نێوان یاسایەکی دادپەروەرانە و یاسایەکی نادادپەروەرانەدا هاوسەنگییەک لە



نێوان دادپەروەری و خۆشەویستیدا بەرقەرار دەکات. بە گوتەی ئەو: «یاسایەکی دادپەروەرانە حوکمێکە لە لایەن مرۆڤەوە بە پێی یاسای ئەخلاق یاخود یاسای خوا؛ یاسایەکی نادادپەروەرانە ئەو حوکمەیە کە لەگەڵ یاسای ئەخلاقدا ناگونجێت.»[٦٦] کەواتە بە بڕوای کینگ، بۆ پاڵپشتیکردن لە گوتەی خوا پێویستە لە بەرامبەر خراپەدا خۆڕاگر بین. بەڵام پێویستە ئەم خۆڕاگرییە ماهییەتێکی خۆبەدوورگر لە توندوتیژیی هەبێت، چونکە جەنگێکە لەگەڵ خراپە نەک لەگەڵ ئەو مرۆڤەی خووی بە خراپەوە گرتووە. بەم بۆچوونە، ناتوندوتیژی «تاکە شتی شیاوی هەڵبژاردن»ە، چونکە ئامانجەکەی بەرقەرارکردنی هەماهەنگییە لە نێوان مرۆڤەکاندا.

کەواتە، بە بۆچوونی کینگ، ناتوندوتیژی لە شێوازێکی کار زیاترە. ناتوندوتیژی شێوازی ژیان و تەنانەت باوەڕێکی ئایینییە. ئەم پەیڤانەی کینگ بەو مانایەن: «من بە تەواوی پابەندم بە ناتوندوتیژییەوە. من هەرگیز مرۆڤێک ناکوژم، چ لە ڤێتنام بێت چ لێرە، هەروەها ئاگر لە هیچ باڵەخانەیەک بەرنادەم... من دەمەوێ پابەند بم بە ناتوندوتیژی، چونکە ئەم فەلسەفەیە، ژیانمان، نەتەنیا دەروەستەیی لە جەنگدا بۆ دادپەروەری نەژادی، بەڵکو پەیوەندییە مرۆییەکانی ئێمە و پەیوەندی من بە خۆمەوە رێکدەخات. من هەمیشە پابەند دەبم بە ناتوندوتیژی.»[٦٧] بە بۆچوونی کینگ، ناتوندوتیژی تاکە رێگایە بۆ دادپەروەری و ئازادی و هیچ رێگەیەکی تر نییە. پێویستە لە نێوان ناتوندوتیژی و نەبووندا یەکێکیان هەڵبژێرین. چونکە بە بڕوای کینگ، بە بێ ناتوندوتیژی هیچ ئایندەیەک نییە، چونکە هەموو جۆرە رق و زەبروزەنگێک دوورمان دەخاتەوە لە ئامانجی کۆتایی کە دروستکردنی «کۆمەڵگای خۆشەویست»ە. کینگ دەڵێت: «پێم وانییە دەسەڵاتی سیاسی ئامانج بێت. هەروەها پێم وانییە دەسەڵاتیش ئامانج بێت. ئەوان بەشێکن لەو ئامانجانەی کە لە ژیاندا بە

دواياندا وتيلين. لەو بڕوايەدام کە ئامانج ياخود مەبەستی هەر کۆمەڵگايەک
برايەتی راستەقينەيە، دروستکردنی کۆمەڵگای خۆشەويستە.»[٦٨] لە
راستيدا، هزری کۆمەڵگای خۆشەويست لە پرۆگرامی کۆنفراسی ڕێبەرە
مەسيحيەکانی باشوور (SCLC)يشدا بەرچاو دەکەوێت. ئەو کۆنفراسەی لە
ساڵی ١٩٥٧ لە پاش ڕووداوەکانی مۆنتگمری، مارتين لۆتەر کينگ
دايمەزراند. «ئامانجی کۆنفراسی ڕێبەرە مەسيحيەکانی باشوور پەلەکردنە لە
دروستکردنی «کۆمەڵگای خۆشەويست» لە ئەمريکا، ئەو کۆمەڵگايەی
برايەتی تيايدا واقيعيەتێکە. بەم شێوەيە ئەو کۆنفراسە هەر جۆرە
تيۆرێکی باشتريی رەشەکان کە جێگيرکردنی زۆرداريیەکە لە شوێنی
زۆرداريیەکی تر رەتدەکاتەوە. ئەو کۆنفراسە نايەوێت بە خێرايی رەوشی
خراپی رەشەکان بگۆڕێت، چونکە ئەم کارە دەبێتە هۆی لە ناوبردنی
دادپەروەری. ئەو کۆنفراسە هەوڵی دروستکردنی يەکپارچەيی دەدات. دوا
ئامانجی ئێمە يەکخستنی واقيعی و يەکپارچەيی ئەکتيڤە لە نێوان
تاکەکاندا. تەنيا ناتوندوتيژی دەتوانێت ئاشتی بێنێتە دی و کۆمەڵگای
خۆشەويست دروست بکات...»[٦٩]

مارتين لۆتەر کينگ لە پێناو دامەزراندنی کۆمەڵگای خۆشەويست
هەوڵدەدات «رۆئيا پێغەمبەرانەييەکەی» لە جەرگەی رۆئيای ئەمريکيدا
بەرقەرار بکات. لەم ڕوانگەيەوە، کينگ باش دەزانێت جارێکی تر بە
بيربهێنێتەوە کە کاری سەرەکی ئەوەيە بە دوای عيسای مەسيحەوە هەنگاو
بنێين. لەم بارەيەوە، کينگ لەو باوەڕەدايە کە بە دامەزراندنی ئەو
کۆمەڵگايەی کە تيايدا مرۆڤەکان برای يەکتر بن، سەقامگيری
فەرمانڕەوايی خوا لە ئەمريکادا مومکين دەبێت.

کينگ چەمکی خۆشەويستی دەخاتە ناوەندی ئەم کۆمەڵگا
خۆشەويستەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، سێ جۆر خۆشەويستی لە يەکتر جيا
دەکاتەوە: ئيرۆس، فيليا و ئاگاپێ. بە بۆچوونی کينگ، ئيرۆس نيشانەی



ئەوينی توند و شەهوانيیە. عشقێکە داوامان لێدەکات خاوەنداری بکەين
وببينە خودان. کەواتە ئيرۆس ئەو خۆشەويستيیە نييە کە لە دڵی کەسی
خۆڕاگری خۆبەدوورگر لە توندوتيژيدا بڵێسە دەدات. «فيليا»ش ئەو
خۆشەويستيەيە کە لەسەر بنچينەی پەيوەنديی بەرامبەر لە نێوان دوو
هاوڕێدا دامەزراوە و ناتوانێت مانايەکی قووڵی لە خەباتی ناتوندوتيژيدا
هەبێت. لە بەرامبەريشدا، «ئاگاپێ» تاکە شێوەی خۆشەويستيیە کە
سەرنجی کينگ رادەکێشێت و لە ڕوانگەی ئەوەوە بە توانای ئاشتی و
پێکەوە هەڵکردن لە قەڵەم دەدرێت. بۆيە، دەڵێت: «ئەو کاتەی کە باس لە
خۆشەويستی دەکەم، مەبەستم زنجيرەيەک حاڵەتی ئيحساسی و سۆزاوی
نييە. داواکردن لە مرۆڤەکان تا ستەمکارەکانيان خۆش بوێن شتێکی بێ
مانايە. پەيڤی خۆشەويستی بەو شێوەيەی کە ئێمە بەکاری دەهێنين،
پيشاندەری دەرککردن و خێرخوازييە کە لە پەيڤی يونانی ئاگاپێ (agape)
وەرگيراوە. ئاگاپێ بە مانای دەرککردنی رزگارکەر، خێرخوازی رزگارکەر و
ئەوينێکی دەوڵەمەندە کە لە بەرامبەردا خوازياری هيچ شتێک نييە.
ئەوەی کە کار دەکاتە سەر دڵی مرۆڤەکان خۆشەويستی خوايیە.»[٧٠]
کەواتە ئاگاپێ نە خۆشەويستيیەکی کۆيلانەيە و نە مايەی ديلێتی. بەڵکو
بە پێچەوانەوە، خۆشەويستيیەکە کە لەڕێی چاکەخوازی بۆ ئەويتر لە کۆتی
رق و کينە رزگاری دەکات. هێزێکە توانای يەکتر خۆشويستن بە مرۆڤەکان
دەبەخشێت بە هەمان شێوەی کە خوا بەهۆی عيسای مەسيحەوە ئەوانی
خۆشويستووە. خۆشەويستييەکی هێندە بەهێزە کە جياوازی لە نێوان دۆست
و دوژمندا ناکات. کينگ دەڵێت: «من بير لە خۆشەويستيیەکی هەرە
بەهێز لە رووی ئەوين و کردەوەدا دەکەمەوە، نەک شتێک لە شێوەی
«دوژمنەکانتان خۆش بوێن» و لێگەڕێ با کاری خۆيان ئەنجام بدەن. بەڵکو
باسکردن لە خۆشەويستی دوژمنان بەو رادەيەی کە بتوانين لە
خواردنگەکاندا لە تەک يەک دانيشين و يارمەتيان بدەين تا بە خۆياندا

بچنەوە، بەو رادەیەی کە زیندان پەسەند بکەین- لەو بڕوایەدا نیم کەسێک هەبێت وا لێکبداتەوە کە ئەمە ئەنجامی زەلیلی و لاوازییە...»[٧١] بە بڕوای کینگ، ئەوین لە جۆری ئاگاپێ کلیلی بەدوورگرتنە لە توندوتیژی. هەر لەو رووەوەیە کە کینگیش بە پەیڕەوکردن لە گاندی، جیاوازی لە نێوان «بەرگریی نێگەتیڤ» و کاربەجێیی یان بێ شەرمییدا دەکات. ئەو دەنووسێت: «دەستەواژەی بەرگریی نێگەتیڤ بە زۆری ئەو تەسەورە ناڕاستە دەهێنێتە ئاراوە کە جۆرە ڕێگایەکە بۆ کار نەکردن و بەم جۆرە کەسی بەرگریکەر بە بێ دەنگی و ئارامی خراپە پەسەند دەکات. بەڵام ئەمە بە تەواوی لە ڕاستی دوورە. بەرەنگاربوونەوەی هاوشان بە ناتوندوتیژی بەو مانایەیە کە لە بەرامبەر رکابەردا شەڕانی نییە. بەڵام زەینێکی چالاکی هەیە و لە هەوڵی وتووێژدایە. شێوازی ئەو لە لایەنی جەستەوە کارتێکراوە، بەڵام لە لایەنی رۆحییەوە زۆر چالاکە.»[٧٢] درێژە پێدەدات و دەڵێت: «بەرگریکردنی خۆبەدوورگر لە توندوتیژی شێوازێک نییە کە تاک لە ترسان یاخود لەبەر نەبوونی ئامرازی توندوتیژی هەڵیبژێرێت، ئەو کەسە خۆبەدوورگرێکی راستەقینە لە توندوتیژی نییە.»[٧٣]

بە بڕوای کینگ، پێویستە ناتوندوتیژی تایبەتمەندیگەلێکی دیکەشی هەبن. سەرەتا ئەوەیە کە نابێت هەوڵی بێ ڕێزکردنی دوژمن بدات، چونکە دوا ئامانجی دروستکردنی لێکگەیشتنە. دووەم، مەبەستی شەڕکردنە لەگەڵ خراپە نەک لەگەڵ تاکی خراپەکار، کەواتە مەسەلەکە زاڵبوونە بەسەر زۆرداریدا نەک زۆردار. سێیەم، ناتوندوتیژی بەبێ رەنج و زەحمەت بەدی نایەت. لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا، کینگ وەکو پەیڕەوێکی بیروباوەڕەکانی گاندی دەردەکەوێت. بەڵام لەبەر ئەوەی گاندی لە بهەگەڤاد-گیتادا بە دوای شوێنێکدا دەگەڕێت کە لە فەلسەفەکەیدا پشتی پێببەستێت، کینگ سەرنج لە ئینجیل و کارەساتەکانی حەزرەتی مەسیح دەدات. بەم شێوەیە کینگ وەکو حەزرەتی مەسیح، وەسیەتی رەنجکێشان لە کاروانی



بەرەنگاربوونەوەی ناتوندوتیژیدا دەکات. ئەو رەنج و زەحمەتەی کە هیوا دەگرێتە خۆی و پاڵنەرێکە بۆ ئاشتیی راستەقینەی نێوان تاکەکان. بە بڕوای کینگ، بەڵێنی ئایندەیەکی باشتر، تەنیا لە ناو کارەساتەکانی مەسیحدا شاراوەیە. ئەگەر عیسا رەنجی خاچی پەسەندکرد بۆ ئەوە بوو راستی دیار بخات. کەواتە پێویستە رەشەکانی ئەمریکا مەسیح بکەن بە نموونە بۆ خۆیان و خاچە تایبەتییەکەیان بکەنە مل. لە پاش ئەوە، کینگ لە میانەی کارەساتی مەسیحدا، بیر لەو رەنجە دەکاتەوە کە تاکی خۆبەدوورگر لە توندوتیژی دەیکێشێت. ئەو دەڵێت: «ناتوندوتیژی بەو مانایەیە کە جەماوەری من بە درێژایی جەنگی دەردناکی ساڵەکانی دوایی، زیاتر لەوەی ئەوانی تر ئازار بدەن، خۆیان ئازاریان چەشتووە.»[٧٤]

مارتین لۆتەر کینگ بەهۆی دڵبەستنەوەی بەو باوەڕە وەتا کۆتایی لەسەر چالاکییەکانی خۆی بەردەوام بوو. بە پێداگرتن لەسەر ڕێگەی ناتوندوتیژی، لە دوای دەیەیەک تێکۆشان بۆ مافە مەدەنییەکان لە ئەمریکای باکوور، بە توندی جەنگی ڤێتنامیش مەحکوم دەکات. لە چواری نیسانی ١٩٦٧ ساڵێک بەر لە هەوڵی تیرۆرکردنی، رۆژانە گوتەی مشتومڕ وروژێنەر لە دژی جەنگی ڤێتنام دەردەبڕێت و دەڵێت: «سووتاندنی بوونەوەرەکان بە ناپاڵم، پڕکردنی خێزانەکانی وڵاتەکەمان لە هەتیو و بێوەژن، بڵاوکردنەوەی تۆوی ژاراویی رق و کینە لە دڵی مرۆڤەکاندا، دووبارە ناردنەوەی ئەو سەربازانەی کە لە دوای جەنگێکی خوێناوی لە رووی جەستە و رۆحەوە بێ ڕێزکراون، هەموو ئەم شێوازانە ناتوانن لەگەڵ عەقڵ، دادپەروەری و خۆشەویستی... هەڵکەن. ئەو نەتەوەیەی کە ساڵ بەساڵ، پارەیەکی زیاتر بۆ بودجە عەسکەرییەکەی سەرف دەکات لە جیاتی ئەوەی بۆ پرۆگرامی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی تەرخانی بکات، لە دەسپێکی مردنێکی رۆحی دایە.»[٧٥]

کەواتە، لێرەدا هەموو نەتەوەی ئەمریکا لەبەر ئەو ڕێگا سیاسییانەی

کە هەڵیانبژاردوون، دەچنە ژێر پرسیارەوە. لەم قۆناغەدا کینگ دەکەوێتە بەر رەخنەگەلێکی توندی حکومەتی ئەمریکا. لە دوای ئەوە «بە ترسناکترین رەشپێست بۆ داهاتووی ئەمریکا» لە قەڵەم دەدرێت.

مارتین لۆتەر کینگ لە چواری نیسانی ١٩٦٨ لە مەمفیس ساڵێک لە دوای وتاردان لەمەڕ جەنگی ڤێتنام لە نیویۆرک، تیرۆر دەکرێت. کینگ لە پێناو رێنمایی کردنی بزاڤی نارازییانە لە بەرگریکردن لە کەناسە رەشپێستەکانی مەمفیس چووبووە ئەو شارەوە. شەوی پێش تیرۆرکردنی، لە یەکێک لە کەنیسەکانی رەشپێستانی ئەو شارە، بۆ دوا جار ئامۆژگاری کردن و هەندێک ئاخاوتنی کرد کە نیشانەی ئاگاداریی پێشینەی ئەو بوون لە مەترسی: «منیش وەکو هەموو کەسێک حەزم لە تەمەنی درێژە، درێژیی تەمەن شتێکی زۆر باشە. بەڵام ئێستا بیر لەو خاڵە ناکەمەوە. دەمەوێ تەنیا بە خواستی خوا کار بکەم. خوا توانای بەسەر چیادا هەڵگەڕانی بۆ من فەراهەم کرد. لەو بەرم روانی خاکی بەڵێنپێدراوم بینی. لەوانەیە من لەگەڵتان بۆ ئەوێ نەکەومە رێ. بەڵام دەمەوێ ئەم شەو ئێوە بزانن کە خەڵکانی ئێمە بە خاکی بەڵێنپێدراو دەگەن...» [٧٦]

گەشتی سیاسیی پڕ رووداوی کینگ لە مەمفیس کۆتایی دێت. بەڵام کەلەپوورە مەعنەوییەکەی تازە وا بەرێ گرتووە. بە گوتەی هاوڕێ و هاوکارە وەفادارەکەی رالف ئەبێرناسی (Ralph Abernathy): «ئەوان روئیا دروستکەریان کوشت، نەک روئیا.» بە مەرگی کینگ، تێکۆشان لە پێناو مافە مەدەنییەکان لە وڵاتە یەکگرتووەکان بەکۆتایی نەهات. لە زۆر شوێنی دیکە، هزر و بیری کینگ لە ناو باسە هەنووکەییەکانی ناتوندوتیژیدا هەمیشە زیندووە. کینگ داوامان لێدەکات بۆ وتووێژی پێویست و بەردەوام لە نێوان میللەتە جۆراوجۆرەکاندا. لەوەش گرنگتر زۆر موکڕانە بە بیرمان دەهێنێتەوە کە «بمانەوێ و نەمانەوێ ئێمە بەیەکەوە بەستراوینەوە.» [٧٧]



**پەراوێزەکان:**

1- Cit in Wallter Harding: A *thoreau Handbook*, New York University Press, New York, 1956,p. 198.

2-Cit in Suzanne Lassier: *Gandhi et la Non- Violence*, Seuil, Paris

1970, p. 39.

3-M.L.King: ˙A Stride Toward Freedom¨ in A *Tastament Of Hope*, Harper and Row publishers, san Francisco 1986, p. 429.

4- Cit in Giles Fracet: *Henry Thoreau*, *L eveille du Nouveau Monde* Sang de la Terre, Paris, 1986, p. 26.

5- H.D. Thoreau: *Journal*( 1837- 1861), Denoel Paris 1986, p. 118.

6- H.D. Thoreau: *Walden*, l Age d Homme, Lausanne, 1985, p. 12

7- Ibid, p. 11.

8-Ibid,p. 84

9-Ibid, p. 257

10-Ibid, p. 257

11- The Correspondence *of H.D. Thoreau, New York University Press, New York, 1958,* cit in Gilles Farcet, op. cit. p. 39.

12- Perry Miller: *Consiousness in Concord*, Hougton Mifflin, Boston, 1958, p. 232.

13-Cit in Arthur Versluis: *American Transcendantalism and Asian Religions*, Oxford University Press, Oxford, 1993, p 82.

14- H.D,Thoreau: *Journal*, op.cit., p.p.108-109.

15-Cit in Arthur Versluis, op, cit. p.85.

16- H.D.Thoreau: *Le D sobeissance Civile*, Mille et une nuits, Paris, 1996, p.46.

17- Ibid,p.15.

18- H.D.Thoreau:*Plaidoyer pour John Brown*, Pauvert Paris, 1968, p. 118.

19- H.D.Thoreau: *La D sobeissance Civile*, op, cit, p.p. 42-43.



20 H.D.Thoreau: Plaidoyer pour John *Brown*, op. cit. p.153.

21- R.W.Emerson: ˙Thoreau|¨ in Ralph Waldo Emerson (The Oxford Authors), Oxford University Press, Oxford, 1990, pp. 478, 490.

22- Quelle est ma foi?

23- Bertrand Russell: *The Autobiography* (1872- 1914) first american edition, 1967, vol I.p.288.

24- Isaiah Berlin: ˙Tolstoy and *Enlighten* ment¨ in R.E. Matlaw: *Tolstoy: A collection of* Critical Essays, New Jersey,1967,p.28.

25- Leon Tolstoi: *Adolescence in Les Oeuvres* Litteraires, Edition Rencontre, Lausanne 1961, vol I, p. 274.

26- Leon Tolstoi: *Oeuvres Completes*, tome II,pp.287-288, cit par Dimitri Sorokine: *Les conceptions de Tolstoi sur l Occident*, Editions YMCA,Paris, 1987.

27- N.Weisbein: *L Evolution Religieuse de Tolstoi*, Hachette, Paris, 1960,p. 104.

28- *La guerre et la Paix, recherche sur le Principe* et *la constitution du droit des gens.*

29- R.Rolland: La vie de Tolstoi, Hachette, Paris, 1947, pp.78-79.

30- Leon Tolstoi: *Paroles d un Homme Libre*, stock, Paris, 1901, pp. 223-224.

31- Leon Tolstoi: *Ultimes Paroles,* societe d Edition et de Publications Parisiennes, Paris, 1909,p. 182.

32- Leon Tolstoi: *Le salut est en vous*, Perrin, Paris, 1893, p.115.

33- Cite in M.I. Markovitch: *Tolstoi et Gandhi*, Librairie Honore Champion, Paris, 1928, p. 99.





34- Cit  in kalidas Nag: *Tolstoty and Gandhi* Pustak Bhanda, Patna, 1950, p. 71.

35- Leon Tolstoi: *Paroles d un Homme Libre*, op. cit . p. 290.

36- Ibid, p. 196.

37- Leon Tolstoi: *La Pens e de l  Humanit* , Ambert, Paris, 1912, p. 260.

38- Leon Tolstoi: *Qu est-ce que l art*?, Perrin, paris, 1918, p. 242.

39- R. Rolland: *Vie de Tolstoi*, op. cit , p.1.

40- M. I. Markovitch: *Tolstoi et Gandhi*, op, cit, p. 17.

41- Cit  in *Tolstoi et Gandhi* de Marc Semenoff, denoel, 1958, p. 42- 43.

42- Cit  in *Ce que Gandhi a vriaiament dit* de Jean Herbert, Marabout Universite, 1974, p. 73.

43- Cit  in *Gandhi* P.U.F (collection Sup), 1967, p.24.

44- Ibid, p. 87.

45- In *Ce que Gandhi a vriaiament dit*, op. cit., p. 80- 81.

46- Ibid, p. 51.

47- Mahatma Gandhi: *The Collected Works*, vol XXXV, Navijivan Trust, 1994, p. 166- 167.

48- In *Ce que Gandhi a vriaiament dit*, op, cit. p. 52.

49- cit  in *Tolerance in Indian Culture,* de R. Balasubramanian, Indian Council of Philosophical Research, 1992, p. 17.

50- Ibid, p.18.

51- Mahatma Gandhi: *The collected works,* op. cit., 1994.

52- In Ce que Gandhi a vriaiament dit, op. cit., p. 114.



53- M. K. Gandhi: *Tous les hommes sont fr res* Gallimard, collection Id es, 1969, p. 142, 100.

54- Cahiers Romain Rolland, no 19, Albin Michel, 1969, p. 326.

55- M. L. K.: ˙ The un-christian christian¨ in *Ebony Aout* 1965, P. 76-80.

56- M.L.K.:˙Toi insen  in *Bulletin du CPE,* Sept. 1988.p. 6-20.

57-vior H.Walton: *The Political philosophy of Martin Luther  king,* Greenwood pub Co., 1971, p. 44 et suivants.

58- cit  par Serge Molla: *Les Idees Noires de Martin Luther king*¨ Labor et Fides, Gen ve, 1992, p. 95.

59- M.L.K: ˙Speech at staff Retreat¨ 67/05/ 29, cit  par S.Molla op. cit. p. 101.

60- M.L.K:˙Address at Berlin¨64/09/13, cit  par S. Molla op. cit. p. 216.

61- Ibid.

kairos (یۆنانی) چەمکێکە لە ئیلاهیاتدا، (تەسەورێکە) لە پەیمانی نوێ دا بە مانای زەمەن یاخود دەرفەتی گونجاو بۆ هەنگاونانی رزگارکەرانە لە مەسیحیەتدا.

62- M.L.K: ˙Toi insens ¨, op cit., p.6- 20.

63- M.L.K: *Combats pour la Libert* , Paris, payot, 1968, p. 105.

64- M.L.K:˙*Is the Universe Friendly*?¨ 65/12/12 cit  par S.Molla, op . cit., p.81.

65- M.L.K: ˙The Crisis in Civil Rights¨ 67/07/10-12 cit   oar S.Molla, op. cit. p. 121.

66- M.L.K: *Je fais un reve*, Paris, Centurion, 1987, p. 34.

67- M.L.K:˙ Showdown for Non -Violence¨ 68 /041. 1609 cit  par Serge Molla in ˙king et la th ologie noire¨ Dossier N.V.A. Consacr  a king, paris, 1992, p. 85.

68- M.L.k: discours du 13 Juillet 1966, ci t in *The Wisdom of Martin Luther king Jr*., Meridian Book New York, 1993, p. 21.

69- Cit  par Serge Molla, op . cit., p. 219- 220.

70- M.L.K: ˙ out of Segergation s Long Night¨, F vrier 1958, cit par S.Molla, op, cit., p.105.

71- M.L.K:˙ Interview¨ . *in Who Speaks for the Negro*? Random House, New York, p.209- 220.

72- M.L.K.: *Stride Toward Freedom*, Harper and Row, New york, 1958, p. 102.

73- Ibid.

74- Cite in Dossier N.V.A., op. cit. P. 36.

75- Ibid, p. 35.

76- M.L.K: *Je fais un reve op*. cit. p.203.

77- M.L.K.:˙Paths to Peace¨, cit  par S.Molla, op. cit., p. 122



## بەشی سێیەم

# کەسایەتییە هاوچەرخەکانی ناتوندو تیژی





## نێڵسۆن ماندێلا

## ئەقڵی لێبوردەیی

«هیچ کەسێک لەبەر رەنگی پێست، رەگەز یاخود ئایینێکی تر، پڕ بە رق و کینەوە لە دایک نابێت».

**نێڵسۆن ماندێلا**

نێڵسۆن ماندێلا (Nelson Mandela) لە پاش ٢٧ ساڵ و شەش مانگ زیندان، لە ١١ی شوباتی ١٩٩٠ لە گرتووخانە ئازاد دەکرێت. چارەنووسی یەکەمین سەرۆک کۆماری رەشپێستی کۆماری ئەفریقای باشوور هەمیشە بە چارەنووسی وڵاتەکەیەوە بەستراوەتەوە. ماندێلا لەتەک والتەر سیسولو (Walter Sisulu)، ئۆلیڤەر تامبۆ (OliverTambo) و زۆر لە کەسایەتییە مێژووییەکانی تری کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقیا (A.N.C) لە دژی ئاپارتاید جەنگا. نزیکەی چل ساڵە ژیانی ئەو بە ژیانی سیاسی ئەفریقای باشوورەوە بەستراوەتەوە. سەرەرای ئەوەش، بێگومان نێڵسۆن ماندێلا لە دیارکەوتنی وڵاتەکەی وەک گەلێکی فرە نەژادی نوێ و، لە لایەنگریی یەکسانی و دیموکراتی دا دەورێکی باڵای گێراوە. ئەمرۆ چیتر ماندێلا گرتووی ژمارە ٤٤٦/٦٤ی رۆبێن ئایسلاند (Robben Island) نییە، و چیتر جیهانەکەی ژوورێکی دوو و نیو بە دوو مەتری. ئەو سیاسەتمەدارێکی متمانەپێکراوی جیهانییە کە لە لایەن گەورەکانی جیهان پەسەنکراوە و مرۆڤایەتی گوێ بۆ گوتەکانی هەڵدەخات و رێزی لێ دەنێت.
ماندێلا بۆ خەڵکێکی زۆر سیمبۆلی رێکخراوێکە: کونگرەی نەتەوەیی







ئەفریقا هەروەها بۆ کۆمەڵە کەسێکیش سیمای زیندووی ئامانجێکە: ئامانجی دیموکراسیی فرە نەژادی و ئاشتی لە ئەفریقادا. بەهەرحاڵ، ماندێلا تاکە ڕێگا چارەیە لەدژی پرۆسەی خێرای توندوتیژی لە ئەفریقای باشووردا. هەر چۆنێک بێت ناوی ماندێلا وەک ڕکابەرێکی سیاسی و هەروەها لە رووی رەفتاری شارستانیانەوە لەبەرامبەر دوژمنانی دوێنێیدا، کەسایەتییەکی سیاسیی نموونەییە. بێگومان دەنگی ماندێلا مرۆڤێکی بێبەش لە ئازادی کە ٢٧ساڵی تەمەنی لە گرتووخانەدا لە پێناو خوشەویستی ئازادیمان و دادپەروەریدا بەسەر بردووە بەبیر دێنێتەوە. زیاد لەوەش نیشانەی مرۆڤێکی دانبەخۆداگرتووە کە هەرگیز رقی لە دڵرەقترین ستەمکارانی نابێتەوە. لەم رووەوە، ماندێلا مرۆڤێکی سەیرو سەرسوڕهێنەرە. ئەو بە چاونەترسییەکەی و لوجیکی نەلەرزۆکی لێبوردەییەکەی هەمووان، تەنانەت دوژمنانیشی سەرسام دەکات. بەم شێوەیە لە وتارێکیدا کە لە ڕۆژی ئازاد کردنەکەیدا لە شارەوانی کاپ تاون (Capetawn) پێشکەشی کرد، دەڵێت: «من تەمەنی خۆم لە پێناوی خەباتی ئەفریقییەکانەوە بردۆتەسەر، من دژی باڵادەستیی سپی پێستەکان جەنگاوم و لە دژی باڵادەستیی رەشپێستەکان جەنگاوم. من ڕێزم لە هزری کۆمەڵگای ئازاد و دیموکراتی گرتووە. کۆمەڵگایەک کە تیایدا هەمووان بە لەیەکتر گەیشتن و قەبووڵکردنی بەرامبەر پێکەوە بژین.

ئەمە ئەو ئامانجەیە کە ئارەزوو دەکەم پێی بگەم و حەزدەکەم لە پێناویدا بژیم. جگە لەمەش، ئەو ئامانجەیە کە ئامادەم لە کاتی پێویستدا گیانم لە پێناویدا بەخت بکەم.»[١] لێرەدا ماندێلا وشە بە وشە ئەو رستانە دەڵێتەوە کە بەر لە ٢٦ ساڵ لە ساڵی ١٩٦٤ لە دوو تویێی سکاڵای ریڤۆنیا (Rivonia) لە کۆشکی دادگای پرتۆریا (Pr toria)دا وتبوونی. لەو کاتەدا نێلسۆن ماندێلا بە تاوانی دەرچوون لە وڵات بەبێ پاسەپۆرت و هاندانی رەشە ئەفریقیەکان بۆ مانگرتنی گشتی لە گیرابوو.



ماندێلا لە کاتی بەرگریکردن لە خۆی لە سکاڵای «ریڤۆنیا»دا لەرێی جەخت کردن لەسەر پرۆسەی خۆپاریزیی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا لە توندوتیژی، مەبەستی چەسپاو و جێگیری ئەو ڕێکخراوەی بۆ وتووێژ و دانوستان ڕاگەیاند: «کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا، باوەڕێکی پتەوی بەوە هەیە کە هەموو مرۆڤەکان، بە چاوپۆشیکردن لە نەتەوە و رەنگی پێستیان، هەموو ئەو مرۆڤانەی کە نیشتیمانیان ئەفریقای باشوورە و باوەڕیان بە یەکسانی و بنەما دیموکراتییەکان هەیە، پێویستە بە ئەفریقی لە قەڵەم بدرێن؛ ئەم ڕێکخراوە لەو باوەڕەدایە کە پێویستە خەڵکی ئەفریقای باشوور، و هەموویان لە بەئازادی، لەسەر بنچینەی ماف و ئیمکاناتی یەکساندا بژین.»[٢] ماندێلا باس لە پابەندبوونی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا بە بنەماکانی یەکسانی و دیموکراتییەوە دەکات. سەرنجی دادوەرەکان تەنیا بۆ بڵاوکراوەی «ئازادی» رادەکێشێت کە لە حوزەیرانی ١٩٥٥ وەک بەرنامەی سیاسیی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا پەسەندکرا. لەم بڵاوکراوەیەدا هاتووە کە: «ئەفریقای باشوور موڵکی هەموو ئەوخەڵکانەیە تیایدا نیشتەجێن، بە رەش و سپییەکانەوە. هیچ حکوومەتێک ناتوانێت لەبەر ئەو دەسەڵاتەی کە لەسەر بنچینەی ویستی هەموو خەڵک دانەمەزراوە بە خۆیەوە بنازێت.... هەموو گرووپە ئێتنیەکان مافی یەکسانیان هەیە... هەموو لەبەرامبەر یاسادا وەک یەکن. پێویستە ئاشتی و برادەرایەتی لەنێو هەموو خەڵکی ئەفریقای باشووردا بەرقەرار بێت...»[٣] بە بۆچوونی ماندێلا، هەموو گرووپە ئێتنییەکان، واتە پێویستە هەموو ئەو مرۆڤانەی لەسەر خاکی ئەفریقای باشوور دەژین، مافی یەکسانیان هەبێت. بەم شێوەیە بڵاوکراوەی ئازادی دەبێتە یاسایەک لە دژی بنەما دژە دیموکراتییەکانی سیستمی ئاپارتاید. ماندێلا کە لە رووی پیشە و هەروەها باوەڕیشەوە لایەنگری یاسایە، چەکی دیموکراسییەتی رۆژئاوا بەرەو رووی ڕکابەرە رۆژئاواییەکانی دەکاتەوە و خۆشەویستی و

ڕێزی خۆی سەبارەت بە شێوازی دادگەریی ڕۆژئاوا دەردەبڕێت، شێوازێک کە بە دەستی مەگنا کارتا (Magna Carta)داڕێژراوە و جاڕنامەی مافی مرۆڤی لێکەوتۆتەوە. ماندێلا دەڵێت: «پێویستە لەم ساتەدا هەوڵی سەرەکیمان بۆ نەهێشتنی جیاوازیی نەژادی و بەرقەرارکردنی مافە دیموکراتییەکان بێت لەسەر بنچینەی بڵاوکراوەی ئازادی .... مەگنا کارتا، جاڕنامەی مافی مرۆڤ و جاڕنامەی جیهانی ئەو دەقانەن کە دیموکراتەکانی جیهان ڕێزیان لێدەگرن. من دەستخۆشی لەسەربەخۆیی و بێلایەنیی دەزگای دادوەریی بەریتانیا دەکەم. کونگرێس، تیۆری جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و سەربەخۆیی وەزارەتی دادی ئەمریکاش هەمان ئەو هەستانەم تێدا دەوروژێنن.»[٤]

کەواتە، لە ڕوانگەی ماندێلاوە، یاساگەلێکی دادپەروەرانە هەن کە پێویستە لەبەرچاو بگیرێن و ڕێزیان لێ بگیرێت، و یاساگەلێکی ناعادیلانەش هەن کە پێویستە سەرپێچیان لێ بکەین و ڕەتیان بکەینەوە. بەڵام چۆن دەتوانین ئەوانە لە یەکتر جیابکەینەوە؟ لێرەدا ماندێلا وەک مافپەروەر ڕای خۆی دەردەبڕێت، چونکە تەنیا ئاماژە بەدەقە یاساییەکان ناکات، بەڵکو (وەک چۆن جاک دریدا– Jacques Derrida– لە وتارێکدا لەبارەی ماندێلاوە دەنووسێت) باس لە مەسەلەی کەسی بەرپرس لەبەرامبەر یاسا دەکات و دەڵێت: «مەحکومیان دەکەن بەتاوانی ئەوەی کەمن خۆپیشاندانەکان ڕێکدەخەم لە دژی ئەو یاسایەی کە کۆمار لە یەکێتی ئەفریقای باشووردا بەرقەراری کردووە، یاسایەک کە ئێمە، نە خەڵکی من وخۆشم بە هیچ شێوەیەک لە بڕیار لەسەردانیدا ڕۆڵێکمان نەبووە. بەڵام ئەو کاتەی یاسا حوکمەکەی دەردەکات، پێویستە لە خۆی بپرسێت لێپرسراوی ڕاستەقینەی پێشێل کردنی ئەم یاسایە کێیە: ئایا منم؟ یاخود ئەو حکوومەتەیە کە پشتگیریی لەم یاسایە کردووە. وێڕای ئەوەی کە دەزانێت، خەڵکی ئێمە و زۆربەی خەڵکی ئەم وڵاتە، دژایەتی



ئەو یاسایە دەکەن، و دەیزانێ کە هەر جۆرە ئیمکانێکی شەرعی بۆ دەرخستنی ئەم دژایەتییە لە ڕێگەی یاساکانی پێشتر و جێبەجێکردنی بەرفرەوانیان لە خەڵکی سەنراوەتەوە؟»[٥] بە بڕوای ماندێلا پێویستە هەموو یاسایەکی دادگەرانە دەربڕی خواستی خەڵک بێت. بەم شێوەیە ئەو حوکمەی گرووپێکی کەمینە بەسەر زۆرینەدا دەیسەپێنێت یاسایەکی نادادگەرانەیە، چونکە سەرچاوەی جۆرێک لە نایەکسانییە. بۆیە پێویستە ڕۆژێک لە پێش چاوی هەمووان و بە ئاگاداری ئەوان یاسا پێشێل بکرێت، بۆ ئەوەی ئەم کارە ڕۆڵێکی ئاشکرایانەی هەبێت. مەبەست لەم جۆرە سەرپێچینەکردنە ئارامکردنی حکومەتە لە ڕێگای پێشێل کردنی ئەو یاسایەی کە بە نادادپەروەر لە قەڵەم دەدرێت. کەواتە، بە بۆچوونی ماندێلا، پێشێل کردنی یاسایەکی نادادپەروەرانەی وەک ئاپارتاید، وەک جێبەجێکردنی یاسایەکی ئەخلاقی وایە. ماندێلا بیرمان دێنێتەوەو دەڵێت: «لەوانەیە دادگا بە سەندنەوەی مافی ناڕەزایی دەردەبڕین لە ئێمە، بیەوێت تێمان بگەیەنێت کە پێویستە لە چوارچێوەی یاسادا کاربکەین. وەڵامی من ئەوەیە، ئەو حکومەتەی کە بەهۆی بەهەڵە بەکارهێنانی یاسا، یاسا بێ ئیعتیبار دەکات، دەبێتە مایەی سووککردنی یاساو هەروەها دەبێتە هۆی ئەوەی هیچ کەسێکی تر بایەخ بە یاسا نەدات. ئەزموونی من لەمبارەیەوە زۆر شتمان فێردەکات. حکومەت یاسا بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی لە ژیانی تاکەکەسیمدا لە ، لە پیشە و لە چالاکیی سیاسیمدا هێندە ئازارم بدات کە ببێتە هۆی ئەوەی یاسا زۆر بەسووک و کەم بزانم.»[٦]

ماندێلا بۆ سەرپێچیکردن لە یاسای نادادپەروەرانەی ئاپارتاید، سەرنج دەداتە ئەزموونی ماهاتما گاندی لە ئەفریقای باشوور، و لە بەشێکی ژیاننامەی خۆی لە کتێبی ڕێگای دژواری ئازادی (Long Walk to free-dom)دا، ڕای خۆی لە مەڕ ناتوندوتیژیی گاندی دەردەبڕێت: «ئەندامانی ڕاپەڕاندنی کونگرەی نەتەوەیی ئەفریقا (A.N.C)و S.A.I.C لە پۆرت

ئەلیزابێس (Port Elizabeth) پێکەوە کۆبوونەوەو ٢٦ی حوزەیران، یەکەمین ساڵڕۆژی نارەزاییان بە ڕۆژی خەبات ڕاگەیاند... هەروەها بۆ زانینی ئەوەی کە ئایا پێویستە خەبات بەپێی بنەماکانی ناتوندوتیژیی گاندی ئەنجام بدرێت، باس وتوویژی لەسەرکرا کرا: واتە بە گوێرەی ئەوەی کە گاندی بە ساتیا گەراهای ناو دەبات، ئەو ناتوندوتیژییەی کە هەوڵبدات لە ڕێی گۆڕینی بیروباوەڕ بە مەبەست بگات هەندێکیان بەرگریان لە ناتوندوتیژی لەسەر بنچینەی هێز کرد و ئەویان لە ڕووی ئەخلاقییەوە لەشێوازەکانی تر بە باشتر زانی. هەروەها گرووپێکیش پێشنیاری کرد کە ئەم مەسەلەیە نە لە گۆشەنیگای بنەماکانەوە، بەڵکو بەدیدی تاکتیک و بەکارهێنانەکەی وەک شێوازێک بەپێی هەلومەرجەکان لێی بکۆڵرێتەوە... هەروەها منیش لەگەڵ ئەم ڕایە بووم، چونکە من ناتوندوتیژیی گاندی بە بنەمایەک نازانم کە ناکرێ ببەزێنرێت. بەڵکو بەتاکتیکێکی دەزانم کە بە پێی پێویستیی بارودۆخ دەتوانرێ بەکار بهێنرێت. چونکە بنەما هێندەی ئەو تاکتیکەی بەکاردەهێنرێت گرنگی نییە، تەنانەت ئەگەر، بەپێی بڕوای گاندی خۆیشی، بە شکست کۆتایی بێت. من داوای نارەزاییەکی خۆبەدوورگیر لە توندوتیژیم کرد، بە ڕادەیەک کە کاریگەر بێت.» (٧)

بێگومان ماندێلا تاکە ئەندامی ڕاپەڕاندنی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا نییە کە جەخت دەکاتە سەر ناتوندوتیژی لەشێوە گاندییەکەیدا، بەڵکو لەوانەیە یەکەم کەس بێت کە هەوڵدەدات پێکەوە ژیانێکی واقیعی لە نێوان هزری گاندی و نەریتی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقادا بەرقەرار بکات. ئەم شێوە گونجاندنەی گاندی لەگەڵ نەریتی ڕەشەکانی ئەفریقای باشوور ئەوە دەردەخات کە بۆچی هەزاران ڕەشپێستی ئەفریقای باشوور بەتەواوی لەگەڵ ماندێلا تەبان و لێی تێدەگەن. کەواتە، ماندێلا دەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ قۆناغە خۆشەکانی ڕابردوو، کاتی پێش هاتنی سپیپێستەکان و جێگیربوونی ئاپارتاید کە ئاشتی و ئارامی لە ئەفریقای



باشووردا بەرقەراربوو. ماندێلا وێنەیەکی ئارام و ڕوونی ئەو سەردەمە دەکێشێت و دەڵێت: «بەر لە چەند ساڵێک، کاتێ گەنجێکی گوندی ترانسکای (Transkei) بووم، چیرۆکگەلێکم لەمەڕ قۆناغە خۆشەکانی ڕابردوو، پێش هاتنی مرۆڤی سپیپێست لە پیرەکانی هۆزەکەم دەبیستن، لەوکاتەدا خەڵکی ئێمە لە ژێر فەرمانڕەوایی دیموکراتی پاشاکان و سەرۆک هۆزەکان دا بە ئارامی و ئاشتی دەژیان و ئازادانە و بێ ترس، بەبێ هیچ سنووردارییەک لەوبەری ولاتەوە دەچوونە ئەو بەر. لەو کاتەدا، زەوی موڵکی ئێمە بوو... ئێستا سوێند دەخۆم کە لە نێو هەموو ئەو گەنجینانەی کە دەکرێ لە ژیاندا بەدەست بهێنرێن، خزمەتکردن بە خەڵکی خۆم و ڕۆڵی بچووکم لە خەبات لە پێناو ئازادیدا هەڵدەبژێرم.» (٨)

کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا لە کانوونی دووەمی ١٩١٢ لە بلووم فۆنتیین (Bloom Fontien) بەدەستی دکتۆر سیمە (Dr. seme) مافپەروەری زۆڵویی دامەزرا. ئامانجی کۆکردنەوەی هەموو ئەو پاشاو سەرکردانە بوو کە ماندێلا باسیان لێوە دەکات. کەواتە، کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا هەر لە دەسپێکی خەباتیدا، سیاسەتی خۆی وەک سیاسەتێکی خۆبەدوورگر لە توندوتیژی و چاکسازیخواز دەستنیشان کرد. بەهاتنی چەند لاوێکی وەک والتەر سیسولو، ئۆلیڤەر تامبۆ و نیلسۆن ماندێلا بۆ ناو سەنتەری کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا لە ساڵەکانی ١٩٤٠ و دامەزراندنی کۆڕی لاوان، ئەم ڕێکخراوە بە ڕێکخستنی مانگرتن و ڕێپیوان و ئابلۆقەدان هەنگاو دەنێتە قۆناغێکی سەرەکی تر لە خەبات و تێکۆشانی سیاسیدا. لە ساڵانی ١٩٥٠، کاتێک ماندێلا سەرۆکایەتی نەتەوەیی کۆڕی لاوانی لە ئەستۆ بوو بە بەردەوامی جەختی لەسەر ناتوندوتیژی وەک تاکە شێوەی مانەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ حکوومەتێکی زۆردار دەکرد. وشەکانی لە بارەی «خەبات» ی ساڵی ١٩٢٥ پشتگیری لەم ڕاستیبە دەکەن: «لەبەرئەوەی لە ماوەی شەش مانگی تێکۆشاندا تەنانەت یەک حاڵەتی توندوتیژیش

لەلایەن ئێمەوە رووی نەداوە شانازی بە خۆمانەوە دەکەین. رێک و پێکی و دیسپلینی خەباتگێڕەکانمان نموونەیە.»[٩] جگە لەوەش، بەدرێژایی «تێکۆشانی سۆفیاتاون»(Sophiatown) لە ساڵی ١٩٩٥ ماندێلا و لایەنگرانی بەپێچەوانەی رای لاوانی شارۆچکەی رەش نشین، ئامۆژگاری بەرەنگاربوونەوەیەکی خۆبەدوورگیرانە لە توندوتیژییان دەکرد. بەم شێوەیە ساڵ بە ساڵ و لە شۆڕشێکەوە بۆ شۆڕشێکی تر، ماندێلا و رەشەکانی ئەفریقای باشوور لەبەرامبەر هێزی پرتۆریا بە خەباتی خۆبەدوورگرتن لە توندوتیژی و سەرپێچیکردنی مەدەنی هەڵسان. ئەم چالاکیانە کە تیایدا یاساکان دەخرانە ژێر پرسیارەوە، لە فەزایەکی پڕ لە رێزگرتن لە روحی یاساکان ئەنجام دەدرا. ماندێلا دەنووسێت: «ئێمە لە بارودۆخێکدا بووین کە دەبوو یان رەوشی هەمیشەیی سووکایەتی پێکردن قبووڵ بکەین یاخود بە ئاشکرایی شەڕ لە دژی حکوومەت بکەین. ئێمە گەیشتینە ئەوەی کە بە ئاشکرایی شەڕ لەگەڵ حکوومەت بکەین. ئێمە خەباتی خۆمان بەپێشێل کردنی یاسا بەبێ پەنابردنە بەر توندوتیژی دەست پێکرد.»[١٠]

ماندێلا کە خۆی یاسازان بوو، لە رەوشێکی دژواریشدا دەستی بە پیشەی پارێزەری کرد. ماندێلا بە درێژایی ساڵەکانی ئیشی مافپەروەری، کەوتەبەر سووکایەتی و ئیهانەکردن، و بۆ کردنەوەی نوسینگەی پارێزەری لە شاردا ئیجازەی رەسمی پێنەدرا، دەڵێت: «هەر لە سەرەتای پیشەی پارێزەریم، لەبەر رەنگی پێستم، هەروەها بە هۆی ئینتیما و لایەنگیریم بۆ کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا رووبەڕووی کێشەی زۆر بوومەوە. یەک لەو کێشانە ئەوە بوو کە تێگەیشتم بەپێی یاسای شارەوانییەکان بەپێچەوانەی پارێزەرێکی سپی پێست ناتوانم بەبێ وەرگرتنی مۆڵەتی رەسمی لەلایەن وەزارەتەوە نووسینگەیەکی کار لە شاردا بکەمەوە. داوای ئەو مۆڵەتەم کرد، بەڵام داواکارییەکەم هەرگیز پەسەند نەکرا. لەپاش بەدواداچوون، لەسەر رەزامەندی یاسای شارەوانییەکان، مۆڵەتی کاتیم پێدرا. بەڵام لە



پاش تەواوبوونی ئیتر نوێ نەکرایەوە. کاربەدەستە حکوومییەکان جەختیان کرد لەسەر ئەوەی من و هاوڕێیەکەم ئۆلڤەر تامبۆ [دەبێ] شار بەجێ بهێڵین و لە شوێنێکی تر کە ٦ هەزار کیلۆمەتر دوور بوو بۆ ئەفریقییەکان چالاکی بنوێنین، شوێنێک کە پارێزەرەکانمان نەیاندەتوانی لە کاتی ئیشە ئیدارییەکاندا سەردانی بکەن. بەم شێوەیە داوامان لێدەکرا کە خزمەتی برادەرانمان نەکەین و واز لە چالاکی پیشەیی خۆمان بێنین کە لە پێناویدا سالانێک خوێندبوومان. هەر پارێزەرێک کە شایستەی ئەو ناوەبێت شتێکی وەهای قبووڵ نەدەکرد. لە ئەنجامدا ئێمە چەند ساڵێک لە شاردا بە شێوەیەکی نایاسایی کارمان دەکرد... ئەمە خۆی جۆرێک لە جۆرەکانی رەتکردنەوەی یاسابوو. ئێمە ئاگاداری ئەو خاڵەبووین، بەڵام ئەم یاسایە بەپێچەوانەی حەزی خۆمان بەسەرماندا سەپێنرابوو، ئێمەش یان دەبوو گوێڕایەڵی یاسا بین یاخود گوێڕایەڵی ویژدانمان.»[١١]

ئەم بەرگرینامەیەی ماندێلا خاڵێکی سەرەکی رووندەکاتەوە. شوێنی ئەو لەشەڕی ئەفریقای باشووراو هەروەها چۆنییەتی تێگەیشتنی ئەو لە ئەرکەکەی پیشاندەدات. ماندێلا زاراوەی «گوێڕایەڵی کردنی ویژدان» بەکاردەهێنێت. سەرپێچیکردن لە یاسا بۆ گوێڕایەڵی کردنی ویژدان، ئەو هزرەیە کە هێزی دیڤید تورو لە وتارێک لە بارەی سەرپێچیکردنی مەدەنی (Essay on civil Disobedience) راڤەی دەکات و گاندی لێی کۆڵیوەتەوە، لە ساڵی ١٩٠٩ دەنووسێت: «کاتێک من پەیڕەوی لە یاسا ناکەم و لەبەر پێشێلکردنی یاسا سزا دەدرێم، هێزی رۆحم لە کار دەخەم کە پێویستی بە خۆبەخت کردن هەیە.»[١٢] مارتین لۆتەر کینگیش دەڵێت: «هەر مرۆڤێک یاسایەک پێشێل بکات کە دژی ویژدانیەتی و بەخواستی خۆی باجی تاوانی کارەکەی بدات بەوەی بکەوێتە زیندانەوە، بە مەبەستی ئەوەی کۆمەڵگا لە نادادگەریی یاسا ئاگادار بکاتەوە، گەورەترین رێزی لە یاسا گرتووە.»[١٣]

بێگومان ماندێلا بیری لە بیروڕاو کردەوەکانی گاندی و لۆتەر کینگ کردۆتەوەو لێیانی کۆڵیوەتەوە، بەڵام ئەو هزرو بیرکردنەوانە بۆ ئەزموونەکانی خۆی لەئەفریقای باشووردا زیاد دەکات. بەم شێوەیە کاتێک ئۆلیڤەر تامبۆ لە ئابی ١٩٨٠ بۆ وەرگرتنی خەڵاتی نەهرۆ لە دلهی دەیناسێنێت، ماندێلا ئاماژە بە لێکچوونی نووسینەکانی گرتووخانەی لەگەڵ گاندی دەکات: «ماهاتما گاندی کاریگەرییەکی سەرسوڕهێنەری لەسەر خەڵکی هیند و ئەفریقای باشوور بەجێهێشتووە. لە راستیدا، گاندی لە خاکی ئەفریقای باشووردا، فەلسەفەی ساتیاگەراهاکانی دۆزییەوەو پەسندکرد.»[١٤] هەروەها لە کاتی قسەکردنی لە کۆنگرەی ئەمریکادا لە حوزەیرانی ١٩٩٠، لە نێو ئەو کەسانەدا کە بۆ مافە مەدەنییەکان لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا تێدەکۆشان، ناوی مارتین لۆتەر کینگ دەبات: «ناتوانین بەبێ ستایشکردن گوێ بیستی وتەکانی سۆجۆرنەر تروس (Sojourner Truth)، فریدریک دۆگلاس (Frederick Doug-lass)، و. ئا. ب. دو بۆوا (W.E.B. du Bois)، مارکوس گارڤەی (Marcus Garvey)،و مارتین لۆتەر کینگ و زۆر کەسی تر بین و بەو ڕێگایانەدا نەڕۆین کە ئەوان بڕیویانە.»[١٥]

لە ساڵی ١٩٦١، دوای قەدەغەکردنی چالاکییەکانی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقاو جینۆسایدی شارپڤیل (sharpevile)، ماندێلا بڕیاری دامەزراندنی شمشێری دوو سەرەی نەتەوە (Vmkhonfo we zizwe)ی داو قۆناغێکی باڵاتری بەرەنگاربوونەوەی لە بەرامبەر ئاپارتایددا هەڵبژارد. ئەو سیپارانەی لە شارۆچکەکانی رەشەکانی ئەفریقای باشووردا بڵاوکراونەوە، ئامانجی ئەم رێکخراوەیان روون دەکردەوە: «هەمیشە وا بیرمان دەکردەوە کە بەبێ رشتنی خوێن و بەبێ شەڕی ناخۆیی دەتوانین بە ئازادی بگەین، هەمیشە وا بیردەکەینەوە... هەندێ جار لە ژیانی میللەتێکدا کاتی وا دێتە پێشەوە کە پێویست دەکات تەنیا یەکێک لەم



دوو رێگایە هەڵبژێرێت: ملکەچی یاخود شەڕکردن. ئێستا لە ئەفریقای باشوور ئەوکاتە هاتووە. ئێمە چیدی ملکەچ نابین و رێگایەکمان نییە جگە لەوەی بە هەموو ئەو توانایانەی کە لەبەر دەستمانن بەرگری لە خەڵک، ئازادی و داهاتووەکەمان بکەین.»[١٦] ماندێلا چاک دەزانێت کە نابێت ئەم توندوتیژییە زیان بە ژیانی مرۆڤەکان بگەیەنێت، بەڵکو ئامانجە ماددییەکان لەبەرچاو دەگرێت. ماندێلا دەنووسێت: «ستراتیجەکەمان هێرشکردنە سەر دام و دەزگا عەسکەری، وێستگەکانی کارەبا، هێڵەکانی تەلەفۆن و تۆڕەکانی گواستنەوەو گەیاندن بوو.. چونکە شۆکێکی لە ژیانی مرۆڤەکان نەدەدا و باشترین هیوا هەماهەنگی نێوان رەگەزەکان لە داهاتوودا فەراهەم دەکرد.»[١٧]

کەواتە لەبارەی ماندێلاوە، جۆرە پەیوەندییەک لە نێوان ئامانج و هۆدا هەیە. چونکە لە راستیدا هۆ خۆی ئەو ئامانجە پیشاندەدات کە هەوڵی بۆ دەدرێ. بەم شێوەیە رێگا تاکتیکییەکان دەکەونە جەرگەی ئەو ئامانجەی کە هەوڵی بۆ دەدرێ و لە بنەڕەتدا ئەم ئامانجە ئامانجێکی ئیلاهییە. بەڕای ماندێلا ئامانج هۆیەکە ئاراستە ناکات. ناشێ ئاوابێت، چونکە پێشتر ئامانج لە هۆدا خۆی حەشار داوە. لەهەر هەنگاونانێکدا کە ماندێلا لەبەرچاوی دەگرت، یەکەم هزر کە بەمێشکیدا دەهات ئاشتی بوو. ئەو لە وتارێکیدا کە لە ١٠ی حوزەیرانی ١٩٩٣ پێشکەشی کرد، گوتی: «خەباتی هاوبەشی ئێمە بۆ کۆتایی هێنان بە تاوانەکانی ئاپارتاید لە دژی مرۆڤایەتی و بۆ گۆڕینی ئەفریقای باشوور بۆ وڵاتێکی یەکگرتوو، دیموکراتی، نارەگەزپەرست و دوور لە جیاکاریی رەگەزی بە خاڵێکی چارە نووسساز گەیشتووە.»[١٨]

ئەم دیموکراسییەی کە ماندێلا بیناسازی سەرەکییەتی لەسەر بنچینەی تیۆری لێبوردەیی بونیاتنراوە. لەلای ماندێلا کە مافپەروەرو مرۆڤێکی لێبوردەیە، رێزگرتن لە ئەوی تر خاڵی سەرەکییە لە تاکایەتییەکەیدا کە

بەدیلی نییە. لەبەر ئەوە، ماندێلا لە دوانە ڕەسمییەکانی و لە کۆنفرانسە گشتییەکانیدا لەدوای ساڵی ١٩٩٠ جەختێکی زۆری لە سەر هزری «لێبوردەیی» دەکرد. لێرەدا باسی چەند حاڵەتێک دەکەین وەک بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەمان:

«کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا لە دەرفەتە جیاجیاکاندا جەختی لەسەر گرنگیی لێبوردەیی کردۆتەوە.»[١٩]

«ئێمە وا فێربووین کە مانەوەی وڵاتەکەمان پەیوەستە بەوەی لەدیدی ئەوینێکی ڕاستەقینەو ڕێزگرتن لە هەموو تاکەکانی نەتەوەو مرۆڤایەتییەوە تێبکۆشین.»[٢٠]

«ئێمە بۆ یەکتر، بۆ داب و نەریت، بۆ ڕەنگی پێستی جیاواز و بۆ ئایینە جۆراو جۆرەکانمان پێویستیمان بە کولتوورێکی نەتەوەیی وا هەیە کە لەسەر ڕێز لێکگرتن بونیاتنرابێت.»[٢١]

«ئێمە، وەک کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا، بەردەوام دەبین لە گێڕانی ڕۆڵی خۆمان و کولتوورێکی سیاسی دروست دەکەین کە لەسەر بنچینەی لێبوردەیی سیاسی دابمەزرێت.»[٢٢] کەواتە، ماندێلا تەنیا سیاسەتمەدار نییە، بەڵکو مرۆڤێکی ئەخلاقگەرایە. لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین هزری لێبوردەیی بە بەردەوامی لە خەباتی ڕابردوو و ئێستای ئەودا ئامادەیە. ڕاستییەکەی ئەم هزرەی لێبوردەیی لە لای ماندێلا هەمیشە دەکەوێتە بەرامبەر واقعی جیهانی ئێمەوە. تەنانەت دژی ئەو واقیعە دەوەستێت تاکو ئەو بارودۆخانە بخوڵقێنێت کە بە وتووێژ کۆتایی بێت. بردنەوەو دۆڕاندن بۆ ماندێلا و ئەفریقای باشوورو هەروەها بۆ داهاتووی جیهانەکەمان گرنگە، چونکە وەک ماندێلا دەڵێ: «هەمووومان لە هاویندا وەک یەک گەرماو لەزستانیشدا وەک یەک سەرمامان دەبێت و ناسینی ئەم مرۆڤایەتییە هاوبەشەیە کە لە توانای دایە وەک نەتەوەیەک پێکەوەمان ببەستێتەوە.»[٢٣]



## دێزمۆند توتو

## ئومێدو ئاشتی

«مرۆڤایەتیی من پەیوەستە بە مرۆڤایەتیی تۆوە، چونکە ئێمە تەنیا پێکەوە دەتوانین مرۆڤ بین»

**دیزمۆند توتو**

لەنێو خزمەتکارانی کەنیسەدا کە لەسەردەمەی ئێمەدا لە رووی تێکۆشان لە رێی ئاشتی و دادپەروەریدا رووخسارێکی دیاری هەیە، دیزمۆند توتو (Desmond Tutu) شوێنێکی تایبەتی هەیەو وەک هاورێبازەکانی مرۆڤێکە، ژیانەی ئایینیەتی، ئایین دلێری و هێزی پێویستی پێ بەخشیوە تا لەدژی کارە خراپ و نەنگەکانی ئاپارتاید بجەنگێت. توتوی ئەسقەف کە رۆژانە لە کانیاوی ئینجیل و ئەوینی مرۆڤایەتیدا ئاودەخواتەوە، لە ساڵەکانی ١٩٨٠ رابەرایەتی جەنگ لە پێناو دادپەروەری لە ئەفریقای باشوور دەگرێتە ئەستۆ و دەروازەیەک بەرەو ئاشتی لەو وڵاتەدا دەکاتەوە. لە ساڵی ١٩٨٤، خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی بە دیزمۆند توتو بەخشرا. بەرای توتو، ئەم خەڵاتە نیشانەیەکە لە خواوە. لە کاتی وەرگرتنی نۆبڵ دەڵێت: «ئەم خەڵاتە زیاتر لە هەر شتێکی تر بەشێوەیەکی جوان پێم دەڵێت جیهانەکەمان جیهانی خوایەو خوا ئەم جیهانە لەبەرچاوی خۆی دوور ناخاتەوە.» توتو بەم پەیڤانە کۆتایی بە گوتەکانی دەهێنێت: «کاتێ خوا لەگەڵ ئێمەدایە، چ کەسێک دەتوانێت لە دژمان بێت؟»[٢٤]

لەگەڵ گوتنی ئەم شتەدا، توتو پشتگیری لە یەکێک لە مەبەستە سەرەکییەکانی خواناسیی رەشەکان دەکات، واتە لەئازادی ستەمدیدەکان، کە ئەم تێگەیشتنە لە هەموو ماوەی ژیانیدا بە روونی دەردەکەوێت. بەدەستەواژەیەکی تر، بە بۆچوونی توتو، هەر شوێنێکی جیهان ستەمدیدەی لێبێ، بە زەرورەت خوا پاسەوانیانە. چونکە بە گوتەی توتو خوای ئێمە



«خوایەکی بێلایەن نییە. ئەو هەمیشە لایەنگری کۆیلە، زۆر لێکراو و قوربانییەکانە، ئەمرۆش هەروایە. ئەو لایەنگری هەژار، برسی، ستەمدیدەو قوربانیانی نادادپەروەرییە.»[٢٥] بەڵام ئەگەر خوا لایەنگری زۆر لێکراوو هەژاران بێ، ئەوا پێویستە لە نێو ئەواندا لەخوا بگەڕێین. واتە کەسێک کە دەیەوێت خوا بدۆزێتەوە، پێویستە لە زۆرلێکراوان نزیک بێتەوە. توتو دەنووسێت: «ئێمە لە خۆمان دەپرسین دەبێ عیسای ئەمڕۆ لەکوێ ببینینەوە؟ ئەگەر بمانەوێ ئەمڕۆ ئەو لە ئەفریقای باشوور ببینینەوە، پێویستە لەنێو ئەو کەسانەدا بین کە بە دوای ئەودا وێڵن، نەک لە نێو لێو بەبزەو رووخۆشەکان، یاخود بەهێزو هەرە باشەکان، بەڵکو لە نێوان ئەوانەدا کە بۆ باسکردن، جگە لەو کەس شک نابەن.»[٢٦]

کەواتە توتو، تەنیا خوا بە بوونی باڵا نازانێت. چونکە بەبڕوای ئەو، سەرەڕای ئەوەی خوا خاوەن زاتێکی باڵایە. بوونێکی سروشتی (فطری)یە کە دەتوانێت نیگەران بێت لەبەر گرفتە رۆژانەییەکانی ئەوکەسانەی زەحمەت دەکێشن. توتو دەڵێت: «لەبەر ئەوەی نادادپەروەری، چەوساندنەوەو ستەمە، ئینجیل و خوای ئینجیل دژی دەوەستن. خوای ئێمە، بەپێچەوانەی خوای گاورەکان، خوایەک نییە کە سیستمی بڕیار لەسەر دراو بە پیرۆزی بگرێت، ئەو خوای سەرسوڕهێنەرییەکانە کە دەسەڵاتداران و نادادگەری لە ناو دەبات تا فەرمانڕەوایی خۆی جێگیر بکات. ئێمە ئەوە لە مێژووی نەتەوەی جولەکەدا دەبینین.»[٢٧]

کەواتە، بەبڕوای توتو، خوا راستەوخۆ کاریگەری لەسەر چارەنووسی ژیانی مرۆڤەکان هەیە، لە راستیدا بە بۆچوونی ئەو، ژیانی مەسیح بەڵگەو شایەدە لەسەر پشتگیری کردنی ئەم شتە: «بەڵێ، عیسا هاتووە تا رایگەیەنێت کە خوا تەماشاکەرێکی بێلایەن نییە. ئەو لایەنگری ستەمدیتە، هەژارو چەوسێنەرانە، ئەمەش نەک لەبەر ئەوەی کە ئەوان پیرۆزترن لە ستەمکاران...»[٢٨] بەم شێوەیە بە بۆچوونی توتو، کارەساتی

مەسیح ڕووداوێکی مێژووییە کە ویستی خواوەند دەردەبڕێت بۆ ئەوەی مرۆڤەکان لە ستەم و زۆرداری ڕزگار بن. خاڵێکە شایستەی سەرنجدان کە بەبڕوای توتو ئەم نموونە ئینجلییە بەسەر بارودۆخی ئەفریقای باشووردا جێ بەجێ دەبێت. لەم ڕووەوە، ئامانجی کلێسا جگە لە بەرەنگاربوونەوەی ستەمکاران ناشێ شتێکی تر بێت. بە گوتەی توتو: «لە ئەفریقای باشووردا، پێویستە کەنیسە کەنیسەیەکی پێغەمبەرانە بێت، کە گوتە (کەلامی)ی خوا بە دەنگی بەرز بڵێتەوە. پێویستە لەدژی توندوتیژی، لە دژی چەوساندنەوەو ستەم بدوێت، لە دژی هەر شتێک کە منداڵەکانی خوا زەلیل دەکات و ئەوان بەکەمتر لەوەی کە خواستی خوایە بزانێت.»[٢٩] بە دەستەواژەیەکی تر بەبڕوای توتو، گوێڕایەڵی کردن لە خواستی خواو یاساکانی خوا شێوازێکە بۆ بەرەنگار بوونەوەی لەگەڵ یاسا سەپێنراوەکانی ئاپارتاید، چونکە ئاپارتاید بیرۆکەی یەزدانی لەمەڕ ئاشتی نێوان مرۆڤەکان ڕەتدەکاتەوەو جەخت لەسەر جینۆلۆجیای سپی پێستەکان دەکاتەوە. توتو دەنووسێت: «ئاپارتاید بەئەنقەست دژایەتی ئەو کارە سەرەکییەی مەسیح دەکات و ڕادەگەیەنێت کە ئێمە بۆ جیاوازی، ناکۆکی، ڕق و نامۆیی کە بەری گوناهن خولقاوین. لەم ڕووەوە ئاپارتاید نە مەسیحییەت و نە کتێبی پیرۆزی نییە، چونکە سیسمتێکە نەک شتێکی لابەلایی، بەڵکو نکۆڵی لە ڕاستی بنەمایەک لە بڕوای مەسیحییەتدا دەکات.»[٣٠] کەواتە، ئاشکرایە کە بە بڕوای توتو بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئاپارتاید پێویستە پابەند بن بەڕێنماییەکانی مەسیحەوە، کەنیسە تەنیا ئەوکاتە دەتوانێت پێشڕەوبێت کەبانگی هیوا، خۆشەویستی و ئاشتی لێ بەرز بێتەوە. بەڕای توتو، ئەوە تاکە ڕێگایە، چونکە «هەموومان ئافەریدەی خوایەکین، مەسیحێک ڕزگارمان دەکات و ڕوحولقودسێک پاکمان دەکاتەوە، [کەواتە] ئێمە یەکین. مانەوەی مرۆڤی سپی پێست پەیوەستە بە مانەوەی مرۆڤی ڕەشپێست و بەپێچەوانەوەشەوە؛ و ئەم



مانەوەیە مرۆڤە پێست ڕەنگاوڕەنگ و ڕەشۆکییەکانیش دەگرێتەوە.»[٣١]

بەم شێوەیە، توتو بە خوێندنەوەی ئینجیلەکان فێرە وانەی خۆشەویستی دەبێت. هەروەها توتو وەکو مارتین لۆتەر کینگ (ئەم جارە لە ڕوانگەی کەنیسەی ئینگلیستانەوە) چەمکی خۆشەویستی دەکات بە چەمکێکی ناوەندی لە خواناسیی ڕەشەکاندا. کەواتە، لەلای توتو پێویستیی بە خۆشەویستی زەرورەتێکی ئەنتۆلۆجییە. ئەم خاڵە بەنموونەیەکی نیمچە دیکارتی دەردەبڕێت: «منی خۆشدەوێ، کەواتە من هەم.»[٣٢] بەبۆچوونی توتو، بوون واتە خۆشەویستی خوا بوون، چونکە خوا مرۆڤی بە خۆشەویستی خولڵقاندووە. کەواتە، پێویستە مرۆڤیش لەبەرامبەر ئەوەدا خوای خۆش بوێت تا سوپاسی خولڵقاندنەکەی بکات. بەڵام خۆشویستنی خوا بۆ خوشویستنی هاوچەشن(مرۆڤ) ئاسان نییە. لە ڕوانگەی توتووە ئەم شتەیەک لا کراوەتەوە. ئەو دەڵێت: «خۆشویستنی خوا بۆ خۆشویستنی هاوچەشن دەگەڕێتەوە. ئەو دووانە یا لە تەک یەکن یاخود هەر دوو کیان ناڕاستن.»[٣٣] و درێژەی پێدەدات: «خۆشەویستی بەرپرسیاریەتی من و هاوچەشنەکەم دەردەخات. کاتێک بەمیهرەوە لە کەسێک دەڕوانی، ڕاستییێکی جیاواز دەبینیت وبەوشێوەیە نایبینی کە کەسێک بێ خۆشەویستی، بە ڕق یان تەنانەت بێ بایەخانە لە هەمان کەس دەڕوانێت.»[٣٤] کەواتە بە بڕوای توتو، بۆ ئەوەی فێرە خۆشویستن بین پێویستە جۆری ڕوانینمان بگۆڕین. بەو شێوەیە ڕادێین لەسەر ئەوەی پێکەوە بژین و بیر لە ئامانجی هاوبەش کە هەمان ئاشتییە بکەینەوە.

ئاشتی ئەو ناوەرۆکەیە کە بە زۆری لەتیۆری یەزدانیی ئازادیدا دووبارە دەبێتەوە. توتو هەموو جۆرە ئازادییەکی بێ ئاشتی ڕەتدەکاتەوە. بەم حاڵەشدا، ئاشتی بەبێ لێبوردن مومکین نییە. توتو دەنووسێت: «ئینجیلی عیسا داوای لێبوردەییەکی بێ سنوورمان لێدەکات .... ئەمە وەک بەشداربوون وایە لە پاشەکەوتی یەزدانییانەیە بۆ ڕزگاربوون.»[٣٥] بۆیە

لێبوردن و بەخشران بۆ ستەمدیدەو ستەمکاران باشترین ڕێگای گەیشتنە
بە ئاشتیی گشتی.

کەواتە، توتو ئازادی فرەنەتەوەیی و فرە ڕەگەزیی مەبەستە، بەبۆ چوونی ئەو، ئازادی ڕەشپێستەکان پەیوەندی بە ئازادی سپی پێستەکانەوە هەیە. بەم پێیە بۆ ئەوەی سپیپێستەکان لە خراپەی ئاپارتاید ڕزگاریان بێت، پێویستە ڕەشەکان بە ئازادی بگەن. توتو دەڵێت: «ئێمە دەروەستین (ملتزم) بەوەی کە ئازادی بە ڕەشەکان ببەخشین، چونکە دەروەستین کە سپیپێستەکانیش ئازاد بکەین، تا ئەوکاتەی ڕەشەکان ئازاد نەبن، ئێوەش ئازاد نابن.»[٣٦] جگە لەوەش دەڵێت: «ئێمە، ڕەش و سپی تەنیا پێکەوە دەتوانین بەردەوامی بە ژیان بدەین. ئێمە، ڕەش و سپی تەنیا پێکەوە دەتوانین مرۆڤ بین.»[٣٧]

کەواتە، بە بۆچوونی توتو بە بێ ئاشتی مرۆڤایەتی بوونی نییە. بەڵام بۆ ئەوەی ئاشتی بەرقەرار بێت، پێویستە حەز لە پێکەوە ژیان بکەین. بنچینەی فەلسەفی-تیۆلۆژیی هزری ناتوندوتیژی لای دێزمۆند توتو لە هەمان ئەو ڕاستییەدا شاراوەیە. توتو پێمان دەڵێت توندوتیژی کارێکی خراپە، چونکە ئاشتی لەناو دەبات و ژیانی هاوبەش دەخاتە مەترسییەوە. بۆیە پێویستە ڕووبەڕووی توندوتیژی ببینەوە، بەڵام لە ڕێگای خۆپاراستن لە توندوتیژییەوە. بە بڕوای توتو، ئاپارتاید شێوەیەکە لە توندوتیژی، چونکە لەپایەی مرۆڤەکان کەمدەکاتەوە، ئاپارتاید ئایدیۆلۆجیایەکی دژ مەسیحییە. توتو دەڵێت: «ئەگەر مەسیحییەت بەجیدی وەرگری، ئەوا ناتوانی پشتیوانی لە ئاپارتاید بکەی، چونکە مەسیحییەت و ئاپارتاید بە تەواوی دژی یەکترن، ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە کەنیسەی ئێمەو ئەوانی تریش دەیڵێن، کە ئاپارتاید بە ئیلحاد لە قەڵەم دەدەن.»[٣٨] کەواتە پێویستە لەنێوان مەسیحییەت و ئاپارتایددا یەکێکیان هەڵبژێرین. لێرەدا توتو نموونەی ئینجیلی دەخاتە بەرامبەر ستراکچەری بەدخوازانەی



ئاپارتاید. بەبۆچوونی ئەو ئەوەی کە پێویستە بەرەنگاری ببینەوە، هێزی خراپەیە کە لەنێو یاسای ئاپارتایددا هەیە. کەواتە توتو لەگەڵ لە ناوبردنی ئەو کەسانەدا نییە کە بەرگری لە ئاپارتاید دەکەن، بەڵکو پێویستە لەدژی ئەو یاسایانە بجەنگین کە ئەو کەسانەی بەرگری لە ئاپارتاید دەکەن خۆیان لە پشتییانەوە دەشارنەوە. ئەم خاڵە گرنگە، گەشبینی ئەنترۆپۆلۆجیستیانەی دێزمۆند توتو و ماهییەتی دوور لە زەبروزەنگی زۆر لە وتارو نووسینەکانی ئەوەمان بۆ دەردەخات. بێگومان کاتێک توتو مرۆڤ لە ڕێی کردەوەکانییەوە دەناسێت، بەهۆی تێگەیشتنی ئنجیلیانەی گوناه (Sato here) توانای ئەو دەستنیشانکردن و جیاکردنەوەیەی هەیە. کەواتە، بەڕای ئەو، گرنگ ئەوەیە کە خراپەکارو خراپە-کە لەسروشتی خراپەکاردایە- تێکەڵ بەیەکتر نەکەین. تەنیا لەبەر ئەوەی: خوا بەقەد ڕشپێست سپیپێستی خۆشدەوێت، بەڵام لە تاوان بێزارە. لەئەنجامدا پێویستە ڕەشپێست بەتوندی لەگەڵ ئەو سیستەمە کەم و کورتەی کە سپیپێست دایدەمەزرێنێت و پارێزگاری لێدەکات بجەنگێت. بەڵام لەهەمان کاتدا پێویستە هەموو جۆرە ڕق و توندوتیژییەک بەرامبەر بە سپیپێست لەخۆی دووربخاتەوە. بەم شێوەیە، بەبۆچوونی توتو، هەڵبژاردنی ناتوندوتیژی تەنیا حەزێکی سادەنییە. ئەوکارە پەیامێکە. توتو لە دەربڕینی بیروڕاکانیدا هۆیەکانی هەڵبژاردنی ناتوندوتیژی راڤە دەکات. بۆ نموونە دەنووسێت: «بزاڤی هۆشیاری ڕەشەکان سەرەڕای هەموو ئەو شتانەی کە دەشێ گوێ بیستیان بووبێت، بزاڤی دوژمنایەتی کردنی سپیپێستەکان نییە.»[٣٩] ولە داکۆکیکردن لەم خاڵە بەردەوام دەبێت: «لە بنەڕەتدا، خەبات و ئارەزووی من بۆ هاتنەدی ئەفریقای باشوورێکی ئازادتر ودادپەروەرترە کە تیایدا ڕێز لە هەموو مرۆڤێک بگیرێت، هەمووان وەک یەک دەستیان بە شتە باشەکانی ژیان ڕابگات، و بۆ ژیان، کارکردن و فێربوون دەرفەتی و ئیمکانی یەکسانیان لەبەردەستدا بێت.... خاکی

ئەفریقای باشوور دابەش ناکرێت، نیشتمان موڵکی هەمووانە، هەموو ئەو ماف و جیاوگانەی کە پەیوەستن بەم نیشتمانەوە، پەیوەستن بە هەموو دانیشتووانەکانییەوە.»(٤٠)

کەواتە دێزمۆند توتو پشت بە تواناکانی مرۆڤ دەبەستێت بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەکی باشتر. بۆیە، رێز لە چەمکی هیوا دەگرێت و دەیبەستێتەوە بە چەمکەکانی خۆشەویستی و دادپەروەرییەوە. ئەو هیوایە لەسەر باوەڕە دەروونییەکەی وی دامەزراوە پێی وایە کە هەموو شتێک لە دەستی خودادایەو واتا لەوەوە وەردەگرێت. ئەو هیوایە بەهۆی ئەو نیشانە جوانانەوە چەکەرە دەکات کە لە باوەڕدا شاراوەن. بە گوتەی ئەو: «لە باغی خوادا هەموو جۆرە گوڵێک دەبینرێن. گوڵەکان جۆراو جۆرن و خوا لە ئەفراندنی رەنگە جۆراو جۆرەکاندا بە هەڵەدا نەچووە. بەم جۆرەیە کە پەلکە زێرینە دەردەکەوێت. پەلکە زێرینە بۆیە پەلکە زێرینەیە چونکە لە رەنگی جۆراوجۆر پێکهاتووە. ئەگەر تەنیا رەنگێکی هەبووایە، ئەوا پەلکە زێرینە نەدەبوو... ئێمەی مرۆڤیش پەلکە زێرینەی خواین.»(٤١)

کەواتە، توتو لەگەڵ ماندێلا تەبایە کە دەڵێت پێویستە هەوڵ بۆ دیموکراسیی فرە ڕەگەزی لە ئەفریقای باشووردا بدەین. خواستی سەرەکیی ئەو، وەکو هەمیشە، ئەوەیە کە شایەدی بەرقەراربوونی ئاشتیی گشتی بێت، بۆیە پێویستە خۆی لە رق و زەبروزەنگ بە دووربگرێت. چونکە ئەو هۆکارانە رێگەی دروستکردنی داهاتوومان لێدەگرن. دەڵێت: «پێویستە هەوڵ بۆ دامەزراندنی ئەفریقای باشووری هاوچەرخ، کۆمەڵگایەکی نارەگەزی، بە راستی دیموکرات و دادپەروەرانە بدەین کە لە رێگا ئاشتەواییەکان دروست بووبێت. ئێمە وەکو کۆمەڵەی(ئەفریقای باشوور) پێویستە لە هەموو شێوەکانی توندوتیژی بێزاربین.»(٤٢)

ئەم گوتەیە دەریدەخات کە شوێنگەی توتو کوێیەو بە چ شێوەیەک لە ئەرکەکەی گەیشتووە. بە بڕوای ئەو داوا لە کەنیسەو کۆمەڵگا کراوە بۆ



بەرقەرارکردنی پەیوەندیی جیدی. بە واتایەکی تر، توتو ئەو شتە پەسەند ناکات کە شوێنی ئاییندار لە کەنیسەیەو سیاسەتیش لە حکوومەتدا. بە بۆچوونی ئەو، پەیامی کەنیسە روونە، پێویستە کەنیسە هۆکاری گۆڕانکاری بێت. پێویستە بە زەروورەت خۆی لە کاروبارە سیاسییەکان هەڵقورتێنێت. «ئەگەر بڵێین سیاسەت هیچ پەیوەندییەکی بە ئایینەوە نییە، وەک ئەوە وایە بڵێین بەشێکی گرنگی ژیانی مرۆڤ پەیوەست نییە بەحوکمی خواوە.»(٤٣) بە واتایەکی تر، توتو ناتوانێت بڕوا بەوە بکات کە کەنیسە وەک دامەزراوێک پێویستە تەنیا لە ئاخیرەت بدوێت. ئەو بەپێچەوانەوە بیردەکاتەوە، پێویستە کەنیسە تارادەیەکی زۆر بایەخ بەم جیهانە بدات. بە بڕوای ئەو کەنیسە لەمەڕ هەڵوێست وەرگرتن لە لایەنی بەرجەستەی سیاسەتدا نابێت بواری گۆمان و رارایی بدات کە دزە بکاتە ناخیەوە. بەڵکو پێویستە بە جۆرێک لە جۆرەکان ویژدانی کۆمەڵگا بێت. توتو لە رێی باسکردنی ئەم بابەتەوە هەوڵدەدات گیانی ئینجیلەکان بدۆزێتەوە. ئەو دەڵێت: «پێویستە ئێمە لەبابەتە روونەکانی کتێبی پیرۆز بکۆڵینەوە تا ببینین کتێبی پیرۆز لەبارەی ئازادییەوە چ دەڵێت. ئایا دەڵێت رزگاری تاک، تەنیا پەیوەندی بە خواوە هەیە و هیچ بایەخێک بە رزگاربوون لە لایەنی کۆمەڵایەتی – سیاسی و چوارچێوەی ئابووری کە تاکەکان لەگەڵیا دەستەویەخەن نادات؟ ئایا دەڵێت گەردوون لە رووی ئایینی و ئەخلاقییەوە بێ لایەنە... ئەوەی لەبازاڕ، لە دادگاو لە ئەنجوومەن و لەشوێنانی تردا روودەدات هیچ مانایەکی ئایینیی تایبەتی نییە؟...»(٤٤)

بە بڕوای توتو، واقیعیەتی کۆمەڵایەتی هێندە بێ میهرو دژی مرۆڤە کە نابێت رووحانییەکانی مەسیحییەت لێی بێدەنگ بن. سەرەڕای ئەوەش، ئەوەی کە کەنیسە ناچار دەکات لە تەک ستەم لێکراوانەوە بێت بڕوابوون بە خوایە. بۆیە پێویستە کەنیسە لەهەوڵی گۆڕانی واقعی کۆمەڵگادا بێت.

بەڵام ئەمەش ئاسان نییە، مەگەر لە دوای کاری دوور لە توندوتیژی. لەم رەهەندانەدا توتو بە ئەرکی خۆی دەزانێت ئەوەمان بەبیر بهێنێتەوە کە ئەوەی گرنگە بەردەوامیی ژیان نییە، بەڵکو بەردەوامیی ژیانی هاوبەشە. ئەو دەڵێت: «بۆ ئەوەی بەواتای راستەقینە مرۆڤ بین، تاکە رێگە ئەوەیە چ سپی بین یان رەش، پێکەوە بین.»(٤٥) ئەم گوتەیەی توتوی ئەسقەف گرنگی و متمانە بە هزرە تیۆلۆژییەکەی لەبارەی ناتوندوتیژییەوە دەبەخشێت. بەری خەباتەکەی، نەمانی ئاپارتاید و هەڵبژاردنی ماندێلا بوو وەک یەکەمین سەرۆک کۆماری رەشپێستی ئەفریقای باشوور. وێڕای ئەوەش رێگای ئەو هێشتا بەردەوامەو شوێن پێی ئەو هەتا هەتایە دەمێنێتەوە.

## دالایی-لاما

## ئامادەبوون و ناتوندوتیژی





«ئێمە پێویستیمان بە دروستکردنی بەرپرسیاریەتییەکی گشتییە بەرامبەر بە یەکترو بەو هەسارەیەی کە لەسەری دەژین، بەرپرسیارێتییەک کە لەسەر دڵپاکی و ویژدان دامەزرابێ.»

**پایەبەرز دالایی- لاما**

تێنزین گیاتسۆ (Tenzin Gyatso)، بە چواردەیەمین دالایی لامایە کە بەدەرکەوتەی ئاڤالۆکیتەشڤارا (Avalokiteshvara) (ئەوەی کە لە خوارەوە دەڕوانێت) لە قەڵەم دەدرێت. بۆدیساتڤا (Bodhisattva)ی گەورەی میهرەبانی، وەک هەموو کەسایەتییە ناودارەکانی تر بووەتە بابەتی چەندین وتارو ژیاننامەنووسی: ئەو نووسەرانەی ژیاننامەی ئەویان نووسیوەتەوە، دالایی- لامایان بە قەدیسێکی پێغەمبەرانە، سیاسەتمەدار و پایەبەرزترین کەسایەتی ئایینیی بوودایی وەسف کردووە. بەڵام دەگمەنن ئەوانەی ئەو بەهزرڤانی ناتوندوتیژیی دەزانن. لەوانەیە هەموو ئەو ناوونیشانانە بگۆڕێن، چونکە لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا [سەدەی بیست]، جیهان کەلەپووری راستەقینەی ماهاتما گاندی لە کەسایەتی دالایی-لامادا بەدی دەکات. راستیدا، لە پاش مردنی گاندی لە کانوونی دووەمی ١٩٤٨، هیچ کەسێک بەو رادەیە کاریگەریی لەسەر هزری هەنووکەیی ناتووندوتیژی نەبووە. ئەو هزرەی کە کەسانێکی وەکو مارتین لۆتەر کینگ، نێلسۆن ماندێلا یاخود دێزمۆند توتو باسی لێوە دەکەن، وێڕای ئەوەی کە دالایی لاماش بەکردەوە وەکو ئەوان سیاسەتمەدارە سەرەڕای ئەوەش رێبەری رۆحی ملیۆنەها تبتییە کە ئەوان ئەو بەباشتر لە مرۆڤ و کامڵتر لەوانی دیکە دادەنێن.

تێنزین گیاتسۆ لە شەشی حوزەیرانی **١٩٣٥** لە گوندی تاکستەر (Tak-ster) کە دەکەوێتە ناوچەی ئامدۆ (Amdo) لە باکووری رۆژهەڵاتی تیبت بەناوی لاما سۆندوپ (Lhama Thondup) چاوی بە جیهان هەڵهێنا. لە

دوو ساڵیدا دالایی-لاما لە لایەن دەستەیەکی نوێنەرانی کۆڕی نەتەوەیی لۆهاسا بە پەیکەری بوودای میهرەبانی بێ کۆتا ناسێنرا. لە پێنج ساڵیدا لەسەرتەخت دانیشت و لەوکاتەوە بە «کوندۆن» (Kundon) یاخود «ئامادەبوو» ناونرا. لە قۆناغی داگیرکردنی تیبت لەلایەن چینیەکانەوە. دالایی-لاما وەک تاکێکی رۆحانی و سیاسەتمەدارێک لە دارام سالا (Dharam sala) لە باکووری هیندستان دەژیا. ئەم مرۆڤە جلەکانی رەنگ عەنابی و زەعفەرانین و رووخسارێکی بەخەندەو پێکەنینێکی منداڵانەی هەیە. لەگەڵ ئەوەی کە بە نیشانەی خوا دانراوە، مرۆڤێکی خاکەڕاییەو دەڵێت: «دەزانی کە بوودا مرۆڤ بوو، منیش خوا نیم. دالایی-لاما بوونی نییە، ناوونیشانێکی ساختەیە، بەڵام ئەگەر رۆژێک بە دەستی چینیەکان لەنێو بچێت، لەوانەیە کۆتایی بەکاری تیبت بێت. بە هەرحاڵ ئەگەر خەڵکی بیانەوێت رابەریان بم، من رابەرێکم. کاتێک لە رووئیاکانمدا رووبەڕووی مەسەلەیەک دەبمەوە، هەمیشە دێنمەوە یادم کە من راهیبێکم و هەرگیز نە دالایی-لامام و نە خوا...»[٤٦] دالایی-لامای پایەبەرز ئەم گوتانە لە وتووێژدا لەگەڵ ڤیجای کرانتی (Vijay Kranti) دا دەدرکێنێ و درێژە پێدەدات: «من پێم وایە کە لە حاڵەتی نەستیدا، ئیحساسی راهیببوونم زۆر بەهێزە. تەنانەت لە روئیایەکانمدا راهیبێک دەدۆزمەوە نەک دالایی-لامایەک کە لە سەرووی خەڵکی تیبتەوەیە.»[٤٧] کەواتە، وا دەردەکەوێت کە خاکەڕایی لە لای دالایی-لاما فەزیلەتێکی زاتییە. بەم پێیە ئەویش وەک گاندی، «کەسێکە کە وێلی راستی»یە؛ ئەو راستییەی ئەو بەدوایدا دەگەڕێت نەک لە فێرستی هزرە دەربڕاوەکان یاخود تیۆرە ئەبیستراکتەکان، بەڵکو لە رەفتارە بابەتی و کۆنکریتییەکاندا تۆمارکراون. کەواتە بۆ ئەوەی راستی بناسین، پێویستە وەکو چاودێرێکی گەشبین کە لە نێو مرۆڤاندا دەژێت و بەشدارە لەهەژاری و مەینەتییەکاندا هەنگاو بنێین. بەبۆچوونی تێنزین گیاتسۆ، ناتوندوتیژی بنچینەی گەڕانە بە دوای





راستیدا. بەمانایێکی تر، ناتوندوتیژی تاکە رێگایە کە بە دۆزینەوەی راستی کۆتایی دێت. کەواتە بە گوتەی دالایی-لاما پێویستە لێبوردەیی وەک پرەنسیپێکی سەرەکی رەفتارەکانمان بکەینە پیشە. دالایی-لاما دەنووسێت: «پراکتیکیترین و ئاقڵانەترین کار بۆ هەمووان ئەوەیە کە دۆستانە لەتەک یەک دانیشین و بەرێزەوە لەبارەی بابەتەکان وتووێژ بکەین. راستی زۆر بە روون و رەوانی پێمان دەڵێت پێویستە لە دەوری یەکتر کۆببینەوە تا ئامانجی هاوبەشمان بچەسپێنین و ئەزموونەکانمان بگۆڕینەوە.»[٤٨] بێگومان لەلای دالایی-لاما، لێبوردەیی وناتوندوتیژی، بەر لەهەر شتێک رەفتاری زەینین. کەواتە، میهرەبانی فەزیلەیەکی سەرەکییە چونکە لەبواری پەیوەندی نێوان تاکەکاندا لێبوردەیی لێدەکەوێتەوە. ئەو دەڵێت: «بەبڕوای من، میهرەبانی سەرچاوەی گەورەی خۆشبەختییە، [چونکە] گەیشتن بە خۆشبەختی لەرێی تووڕەیی یاخود کینەوە شتێکی نامومکینە.»[٤٩] بەڵام ئەو لە لوجیکی لێبوردەییەکەیدا زیاتر قووڵ دەبێتەوەو میهرەبانی بەبنچینەی ئایینی جیهانی دەزانێت: «خاڵی سەرنجڕاکێش لەبارەی میهرەبانییەوە ئەوەیە کە بۆ پیادەکردنی پێویست بە چوونە نێو کەنیسە یان پەرستگا یان رۆچوون لە فەلسەفەدا ناکات... دارمای راستەقینە ئەوەیە کە خۆپەرست نەبین و خەمی خەڵکانی تر بخۆین. ئەم کارە دەبێتە هۆی لێک نزیکبوونەوەی مرۆڤەکان و دروستبوونی ئاشتی و لێکحاڵیبوونی جیهانی. بۆیە دەڵێین میهرەبانی ئایینێکی جیهانییە چونکە تەنانەت خوانەناس و بێ دینەکانیش باوەڕیان پێیە.»[٥٠]

کەواتە بەبڕوای دالایی-لاما، سروشتی لێبوردە وەک رەفتارێکی پوزەتیڤ وایە بۆ دروستکردنی گیانێکی ئایینی. بەپێی ئەم بۆچوونە، پێویستە هەموو گیانێکی ئایینی رێز لە لێبوردەیی وەکو نیشانەیەکی خۆشەویستی و هاودەردی سەبارەت بە ئەوانی تر بگرێت.

ئەرکی ئایین دروستکردنی تاکی لێبوردەو لە خوا ترسە. تێنزین گیاتسۆ دەڵێت؛ بەشێوەیەکی گشتی، ئامانجی هەر دینێک، هەر ئایینێک یاخود هەر دارمایەک ئەوەیە لە شوێنکەوتووانی مرۆڤی باش دروست بکات. مرۆڤی باش کەسێکە کە دڵپاک بێت، و دڵپاکی بۆ مرۆڤ گرنگترین توخمی خۆشەویستی، هاودەردی، بەخشین و لێبوردنە.»[51]

پەیامی دالایی- لاما زۆر روونە: بۆ ئەوەی ئەوانی تر فێرە چاکەکردن بکەین، پێویستە خۆمان لێبوردە و چاک بین. بەدەستەواژەیەکی دیکە، بە بڕوای ئەو، لێبوردەیی دەبێتە هۆی بێدارکردنەوەی ئەو چاکە زاتییەی کە لە هەر یەکێک لە ئێمەدا هەیە. ئەوەش بەو مانایەیە کە هەموو مرۆڤەکان لە زاتی خۆیاندا باشن، بەڵام چونکە لە ژێر دەمامکی رق و توندوتیژییدا دەیشارنەوە بێ ئاگان لە سروشتە(فطرە) راستەقینەکەیان.

پێویستە پشت بە سروشتی خۆمان ببەستین کە فێرمان دەکات «لە سروشتی ئێمەدا، چاکەو میهرەبانییەکی بنچینەیی و زۆر بەهێز هەیە.. ئەو چاکەیەی کە بە هەموو جیهاندا بڵاوبۆتەوە و رۆژێک لە رۆژان بەرەو نیرڤانا رێنماییمان دەکات. بەڵام ئەو چاکەیە زۆر ناسکە، چونکە کوشتنی سەگێک دەشێ سیستمی جیهان سەراوژێر بکات. هەروەها پێویستە چاکە شاراوەو بەدزییەوە بێت، بەبێ خۆ بەزل زانی، توندوتیژی و چاو برسییەتی، کە ئەمانە ئەو دەمامکانەنی کە لەسەر رووخساری زۆربەماندا هەن.»[52]

کەواتە، بەڕای دالایی-لاما، لێبوردن ناسینی دیفاکتۆی- واقعیی ئەوی ترە. سەرەڕای ئەوەش توندوتۆڵکردنی شتێکی هۆگرو ئاشنایە کە هەمان چاکەی مرۆییە. وێڕای ئەوەش ناسینی «یاسا»یێکە کە توانای ئەخلاقی ئازادی و لێپرسراوێتی بە هەموو مرۆڤێک دەبەخشێت. کەواتە هەر جۆرە رەفتارێک کە باس لە گرنگی پێنەدان دەکات وەک ئایدیای سەرەکیی لێبوردن لە ناو دەبات و رەفتاری پۆزەتیڤی نیگەرانی بۆ ئەوی تر



وەک بنچینەی گونجانکاریی گشتی دەخاتە شوێنییەوە. مەبەستی دالایی- لاما لە ئەوی تر هەموو رەگەزێکی زیندووە کە بەشدارە لەم گونجانکارییە گشتییەدا. لەم رووەوەیە کە دەڵێت: «کوشتنی گیانەوەرێک گونجانکاریی گشتی تێکدەدات.»[53]

ئەو گونجانە گشتییەی کە دالایی-لاما باسی لێوە دەکات کورتەی تیۆری «وابەستەیی بەرامبەر»ە کە بەگێڕانەوە لەبودا لە ئاڤاتامساکا سوترا (Avatamsaka Sutra)دا هاتووە. بەزمانێکی سادە ئەوە دەگەیێنێت کە هەر رەگەزێک لە جیهاندا وابەستەیە بە ئەوی ترەوە، چونکە هیچ شتێک بوونێکی بەشبەش (وجود المجزء)ی نییە، بەشبەشی خۆی بوونی نییە. کەواتە مرۆڤیش وەک جۆرەکانی تر، بەشێکە لەجیهان و پێویستە بە ئاشتی و خۆشییەوە گونجانکاریی خۆی بپارێزێت. تێنزین گیاتسۆ پاڵپشتی لەو خاڵە دەکات کە: «سەفای رۆح و هاودڵی لەریزی خەسڵەتە زەرورییەکانن، هەموو هەوڵێک بەبێ ئەوان بێ سوودە. ئەم خەسڵەتانە هەم پێویستن و هەم نکۆڵی لێنەکراو. ئێمە دەتوانین هەموو شێوەکانی ئایین رەتبکەینەوە، بەڵام ناتوانین سەفای رۆح و خۆشەویستی لەخۆمان جیابکەینەوەو دووربخەینەوە.»[54] ئەوە هەستی ئاشتی و سەفاو هاودڵییە لەئێمەدا، تەنانەت ئەگەر شاراوەو داپۆشراویش بێت. رۆحی مرۆڤ تووشی هەراسانی و کینە دێت، بەڵام ئەم ئالۆزکارییە هێزێکی زاڵ نییە. بۆ گەیشتن بە حەقیقەتی خۆمان، پێویستە رێز لەئەوانی تر بگرین. پاشان ئەم گەڕانە بەدوای راستییە تەنیا لەتوانای دایە لەسەر بنچینەی ناتوندوتیژی سەقامگیر بێت. چونکە ئەو راستییەی کە دالایی-لاما بەدوایدا وێڵە تەنیا راستیی رۆح نییە، بەڵکو راستیی کردەوەشە.

بۆیە، پێویست دەکات جارێک و بۆ هەمیشە لە پێناو بەرگریکردن لە راستی، هزری خراپەکردن لەخۆمان دوور بخەینەوە. لە دژایەتیدا لەگەڵ ئەم هزرە، هەندیک لە ئایینەکان لە هەوڵی ئەوە دان خوای خۆیان بە زۆر

بسەپێنن. لەم بارەیەوە، هەڵوێستی دالایی-لاما روون و بێ خەوشە: «ئەوەی کە دەڵێت خوای ئەو تاکە خوایە بەکارێکی مەترسیدارو زیانبار هەڵدەستێت، چونکە بە هەموو شێوەیەک دەیەوێت بڕوای خۆی بەسەر ئەوانی تردا بسەپێنێت.»[٥٥] بە بۆچوونی دالایی-لاما بەشێوەیەکی گشتی خۆشەویستیی خەڵک و ژیان بوونی مرۆڤ دەنەخشێنن، چونکە لەراستیدا خۆشەویستی خوا کە جەوهەری ئایینەکانە، شێوازێکە بۆ گەیشتن بە راستیی ژیان کە هەمان ئاشتی و بەیەکەوە گونجانە. بۆیە، دالایی-لاما لە وتووێژ لەگەڵ ئەسقەفی گەورەی کانتربوری دادەڵێت: «بیروباوەڕە جیاجیاکان رێگاگەلێکی جۆراوجۆرن کە بە مەبەستێک کۆتایی دێن.»[٥٦] ئەوە بەو مانایەیە کە هەموو ئایینەکان پشکێک لە راستی و پشکێکیان لە هەڵە تێدایە. بەڵام بە بڕوای ئەو، پێویستە هەموو جۆرە رەفتارێکی ئایینی بە زەروورەتی «دیموکراسیی مەعنەوی» پاڵپشتی بکرێت. دالایی-لاما دەنووسێت: «دیموکراسیی مەعنەوی بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستیی گشتی... زانینی ئەو راستییەیە  کە هەموو بوونەوەرێک حەزی لە خۆشبەختیی خۆی دەکات و مافی یەکسانیان هەیە بۆ خۆشبەختی. دیموکراسیی مەعنەوی لەسەر بنچینەی ئەو راستییە راوەستاوە کە مەبەستە خۆ ویستەکانی تاک.... هەرگیز لە مەبەستەکانی کۆمەڵ و گروپ باشتر نین.»[٥٧] لە هەمان رووەوە، دالایی-لاما لەو بڕوایە دایە کە پێویستە لەسەر هەر ئایینێک سەر بۆ ویستی خەڵک دانەوێنێت، ئەگەر نە ناتوانێت لە دڵی خەڵکدا جێی خۆی بکاتەوە. نابێت ئایینی بوودا پێچەوانەی دیموکراسی بێت. هەر لەم رووەوە دالایی-لاما داوای دیموکراسی بۆ تیبت دەکات. ئەو دەڵێت: «ئایدیای ئێمە لەبارەی ئاییندەی تیبتەوە بەتەواوی روون و ئاشکرایە. پێویستە تیبت دیموکراسییەکی واقیعیی هەبێت.»[٥٨] کەواتە بە بڕوای دالایی-لاما، بەرقەراربوونی هەر جۆرە دیموکراسییەک لەتیبت پێویستی بە بەگەڕخستنی سیاسەتی ناتوندوتیژی



هەیە لەم وڵاتەدا. ئەو دەڵێت: «تیبتێکی ئازادم دەوێ کە نیشتمانی ahimsa بێت، تیبتێک کە زیانمەند نەبێت، حەرەمی ئاشتی و سەفا بێت، کە لە توانای هەموو کەسێکدا بێت ئازادانە بچێتە ناوی تا سەر لەنوێ خۆی دروستبکاتەوە....»[٥٩]

بەم شێوەیە یەکێک لە حەزو خواستە گرنگەکانی دالایی-لاما خۆڕاگرییە لە بەردەم ئینتیدابی چەوسێنەرانەی چین و ئەو ئیمکانەی بۆ خەڵکی تیبت رەخساند کە بەبێ پەنا بردنە بەر شێوازەکانی بەکارهێنانی هێز و توندوتیژی رابەرایەتی خۆی بگرێتە دەست. بە بڕوای ئەو، بۆ راوەستان لە دژی حکوومەتی چین ، باشترین رێگە بۆ تیبتییەکان، ئەوەیە فێربن دیموکراسی لەنێوان خۆیان دا پیادە بکەن. بۆیە، ناتوندوتیژی وەک باشترین رێگای بەرەنگاربوونەوە پەسند دەکات. چونکە لەو بڕوایە دایە ئەوانەی بۆ خەباتکردن لە دژی چینیەکان رێگەی زەبروزەنگ هەڵدەبژێرن، لە کاتی زاڵبوونیان بەسەر چینیەکاندا بەجگە لە توندوتیژی بەشتێکی دیکە فەرمانڕەوایی لەسەر تیبت ناکەن. ئەو دەڵێت: «هەندێک خەڵک بۆچوونێکی جیاوازیان هەیە؛ پێیان وایە  توندوتیژی تاکە رێگاییە بۆ گوێ گرتن لە گوتەکانیان. دەزانم ئەم شێوازەی بیرکردنەوەیە لۆجیکی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام من بەو شێوەیە بیرناکەمەوە.... بە بۆچوونی من زەبروزەنگ هەرگیز رێگایەکی راست نییە، چونکە بەم شێوەیە بۆ چینیەکان زۆر ئاسانە ستەمکارانە خەڵکی تیبت سەرکوت بکەن و نامیهرەبانانە تیبت تەفروتوونا بکەن.»[٦٠] دەبینین کە دالایی-لاما تا چ رادەیەک پابەندە بە گاندی و بنەمای ناتوندوتیژیی گاندییەوە. بۆیە، لە هەموو هەلێکدا خۆی بە پەیڕەوی گاندی ناودەبات و دەڵێت: «من بڕوام بە ahim-sa هەیە، بەو شێوە دوور لە توندوتیژییەی کە گاندی ئاماژەی پێ کردووە.»[٦١] هەروەها لە وتووێژێکدا لەگەڵ جان کلود کارییێر (Jean-Claude Carriere) باس لە کاریگەری گاندی دەکات و دەڵێت: «بە

پێچەوانەی هەندێ ڕواڵەت، پێم وایە چەمکی ahimsa، چەمکی ناتوندوتیژیی پێشخستووە. لەسەردەمی ماهاتما گاندیدا، ئەو پیاوەی ڕێزی دەگرم، زۆربەی جار ناتوندوتیژیی بە لاوازی، کارنەکردن و تا ڕادەیەک بەترس لێکدەدرایەوە. لە کاتێکدا وا نییە. ئەمڕۆ ناتوندوتیژی کارێکی پۆزەتیڤەو نیشانەی هێزە.»[٦٢]

پێویستە ڕێنماییەکانی بووداش بخەینە سەر ڕێنماییەکانی گاندییەوە. بەرای بوودا، ناتوندوتیژی جەوهەری ئایینە، و بێ کۆتا ڕێز لە هەموو بوونەوەوە زیندووەکان دەگرێت. بەگوتەی دالایی-لاما: «مامۆستاکەمان ڕێگای ناتوندوتیژی، لێبوردەیی و هاودڵی پیشانی ئێمە داوە.»[٦٣] لە ڕوانگەی دالایی-لاماوە، هەموو خەڵکی تیبت خۆ لە توندوتیژی بە دوور دەگرن، هەر بۆیەشە ئایینی بودایان هەڵبژاردووە. «خەڵکی سەرتاسەری جیهان دەڵێن خەڵکی تیبت لە میهرەبانی و چاکەدا هاوتایان کەمە. جگە لەوەی بەدرێژایی چەند سەدەیەک لە ڕێی ئامۆژگاری و پەندەکانی بووداوە ناتوندوتیژی هاتۆتە کایەوە هۆیەکی تر نابینم بۆ ئەم تایبەتمەندییەی کولتوورمان.»[٦٤]

ئەم دوو هۆکارە کاریگەرە بێ هاوتایانە دالایی-لاما بەتامەزرۆوە بەرەو ئاشتی دەبەن. بە بۆچوونی ئەو بێ ئەم لاو ئەولا بەبێ پیادەکردنی واقیعیانەی سیاسەتی ناتوندوتیژی ناشێ بەئاشتی بگەین، هەروەها بەبێ مەیلی ڕاستەقینە بۆ ئاشتی ناشێ هەنگاو بۆکاری دوور لە توندوتیژی بنێین. ئەو دەڵێت: «ناتوندوتیژی تەکە ڕێگەیە بۆ خەڵکی ستەمدیدەی زەوی تاکو بەرەو ئاشتی و ئارامیی سەقامگیر هەنگاو بنێن.»[٦٥] مەبەستی تێنزین گیاتسۆ لە ئارامیی، هەم ئارامی دەروونییەو هەم ئارامی دەرەکییە لە جیهاندا. بە بۆچوونی ئەو، هەموو جۆرە هەوڵێک بۆ گەیشتن بەئارامیی دەروون، کلیلێکی پێویستە بۆ دروستکردنی ئارامی لەجیهاندا.

لە ساڵی ١٩٧٣، دالایی-لامای پایەبەرز بە جیهاندا دەگەڕێت، تاکو



سەرنجی جیهان بۆ زەروورەتی ئاشتی و بەرپرسیارێتی گشتی ڕاکشێت. بەم مەبەستە، وتارخوێنی و چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی ساز دەکات. لە تشرینی یەکەمی ١٩٨٩،کە دالایی-لاما لەلایەن دادوەرەکانی ئۆسلۆوە خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی پێدەبەخشرێت؛ لە وەڵامی پرسیاری پەیامنێراندا لەبارەی ئەم خەڵاتەوە دەڵێت: «پێویست بوو ئەم خەڵاتە بەهاوبەشی بەمن و دێنگ شیاپینگ (Deng Xia Ping) ببەخشرایە. بەم شێوەیە دەمان توانی لەئۆسلۆ چاومان بەیەکتر بکەوێت و وتووێژ بکەین.»[٦٦] ئەمە بەو مانایەیە کە دالایی لاما بڕوای بە هیچ جۆرە ئاشتییەکی پشت بەستوو بە کینە و تۆڵەکردنەوە پەسەند ناکات. چونکە بە ڕای ئەو، بناغەی ئاشتی ڕق و کینە نییە، بەڵکو خۆشەویستییە. ئەو دەڵێت: «هەمیشە لەو بڕوایەدام کە خۆشەویستی و هاودڵی بناغەی ئەخلاقی ئاشتین لەجیهاندا. هاودڵی واتە خۆشەویستییەکی فرەوانتر کەتەنانەت خراپترین دوژمنیش دەگرێتەوە.»[٦٧]

«بێزار نەبوون لەدوژمن»، بەمانای ڕاستەقینەی پەیڤەکە یەکێکە لە کۆڵەگەکانی باوەڕ. حوکمێکی ئەخلاقی سادە نییە، بەڵکو ڕاگەیاندنی ئومێدێکە کە لە هزرە سەرەکییەکانی بوودیزمی تیبتیدا جێگر بووە. «نابێت تۆڵە لەو کەسانە بکەینەوە کە تاوانیان لە دژی ئێمە ئەنجام داوە یان وەڵامی تاوانەکانیان بە تاوانێکی دیکە بدەینەوە. پێویستە تێبگەین کە بەپێی یاسای کارما، ئەوان ڕووبەڕووی ئەو مەترسییە بوونەتەوە کە دواتر ژیانێکی بێ ڕێزو مەینەتیاریان دەبێت. ئەرکی ئێمە لەبەرامبەر ئەوان و هەر بوونەوەرێکی تر ئەوەیە کە یارمەتیان بدەین تاکو بەرەو نیرڤانا بەرزببنەوە.»[٦٨] کەواتە بە بۆچوونی دالایی-لاما، خۆشویستنی هاوچەشن (مرۆڤ) و پیادەکردنی سیاسەتی ناتوندوتیژی یەکێک نییە لە ئیختیارەکان، بەڵکو تاکە ئیختیاری شیاوە بۆ بەرقەرارکردنی هاوسەنگی لە نێوان هۆو ئامانجدا. چونکە ئەگەر ئاشتی و ئاشتەوایی نێوان مرۆڤەکان

له هەموو کارەکانیاندا دەرکەوێت، ئەوا پێویست نییە بیر لە هۆ بکەینەوەو بەجیا لێی بکۆڵینەوە. هەروەها پێویستە کێشەی ئاڵۆزی ئەو زەحمەتەش چارەسەر بکەین کە لەبەرامبەر پیادەکردنی توندوتیژی ئەویتردا دەیکێشن. دالایی-لاما بە گەڕانەوە بۆ بیروباوەڕەکانی بوودا وەڵامی ئەو مەسەلەیە دەداتەوەو بێگومان وانە لە تاقیکرنەوەکانی مرۆڤ بە گشتی وەردەگرێت. بەم شێوەیە بەسەرنجدان لەسەردەمی خۆی و هەروەها نیگەرانبوون لە ئایینده دەڵێت: «ئەگەر لەو گەشەسەندنە بکۆڵینەوە کە لەسەدەی بیستەمدا هاتۆتە کایەوە، تێدەگەین کە هۆی بنەبڕی ڕەنجی مرۆڤ، لەدەستچوونی پلەو پایەی مرۆڤ و سەندنەوەی ئازادی و ئارامییەکەی، ئەوەیە کە لە چارەسەرکردنی جیاوازییەکان و پێکدادانەکانیاندا هیچ نوخێکیان بۆ توندوتیژی دانانەوە. بەیەکێک لە ئیعتبارەکان دەتوانین سەردەمی ئێستا بەسەردەمی جەنگ و خوێنرێژی ناو ببەین. بۆیە پێویستە ئێمە بەشێوەیەک کار بکەین تا ڕۆژگارێک بێت جیاوازییەکان بە وتووێژو ناتوندوتیژی چارەسەر بن.» (٦٩)

بەم شێوەیە دالایی-لاما هەمیشە ناچارمان دەکات بیربکەینەوە. ئەوەی فێرمان دەکات ئەوەیە کە هەمیشە ئاشتی ئاسانەو باشترە لە جەنگ و تۆڵە کردنەوە. کەواتە ئێستا کە ئاشتی باشترە پێویستە جارێکی تر لە کەلاوەرۆژنەی هزری ناتوندوتیژییەوە لێی بکۆڵرێتەوە. چونکە ڕۆشنایی ئامادەبوون لە لای دالایی-لاما هەمان دەرکەوتنی گیانی ناتوندوتیژییە.

## دایکە تێریزا





## قەدیسی نێو هەژاران

«دوعا بەری بێدەنگییە، باوەڕ بەری دوعایە، خۆشەویستی بەری باوەڕە، خزمەت بەری خۆشەویستییە، ئارامی بەری خزمەتە.»

**دایکە تێریزا**

بێگومان دایکە تێریزا (M re Teresa) یەکێکە لە بەناوبانگترین کەسایەتییە ئایینیەکانی سەدەی بیستەم. هەمیشە لە نێو هەژارو دەرکراوەکانی کۆمەڵگای هاوچەرخدا ژیاو ژیانی خۆی بۆ ئەوان تەرخان کرد و سەرەنجام لە هەشتی ئەیلوولی ١٩٩٧ لەتەمەنی ٨٧ ساڵیدا لەشاری کلکتە کۆچی دوایی کرد. ئەو لە ژیانیدا لە ریزی قەشەکاندا بوو. لە دەی کانوونی یەکەمی ١٩٧٩ لەشاری ئۆسلۆ خەڵاتی نۆبلی ئاشتی پێ بەخشرا. جیهان لەو ڕۆژەدا بەقەدیسێکی ئەندام بچووک، پێچراوە لە سارییەکی سپی و شیندا، بەباڵایەکی چەماوە لەبەر پیری و خاکەڕایی بەڵام بەشکۆ ئاشنابوو. لەو ڕۆژە بەدواوە ناوبانگی دایکە تێریزا لەهەموو جیهاندا زیاتر بڵاو دەبووەوە. هەندێ کەس حسێبی گوتەی حەزرەتی عیسای مەسیح بۆ گوتەکانی ئەو دەکەن. کۆمەڵێکی تر مادام تێریزا بەنیشانەی دەستگیرۆیی کۆمەڵایەتی و مرۆڤگەرایی پراکتیکی لەقەڵەم دەدەن. بەڵام هەر چییەک بێت. ناوی ئەو بە پەیڤی خۆشەویستی و ئەوینەوە بەستراوەتەوە. دایکە تێریزا کە لە ریزی قەشە گەورەکانی کەنیسەی کاسولیکییە، بە خەباتی دوور لەتوندوتیژییەکەی لە دژی هەژاری و نەداری ویژدانی سەدەی ئێمەی بەئاگاهێناوەتەوە.

ئاگنێس گۆنخا بۆجاخیو لە ٢٦ی ئابی ١٩١٠ لەشاری سکۆپچ (Skop-je) لە مەکەدۆنیا، لەدایک و باوکێکی ئەلبانییەوە چاوی بە جیهان هەڵێنا. دواتر بە دایکە تێریزا ناسرا، لە دوو منداڵی خێزانەکەی بچووکتر

بوو. باوکی، نیکۆلا لە بازرگانە دەوڵەمەندەکان بوو، سەفەری بۆ ئەوروپادەکرد بۆ فرۆشتنی شتومەکی جوانکاری. دایکەی کە ناوی درانا (Drana) بوو کچی فرۆشیارێکی کاڵاو خاوەن زەوی بوو. ئاگنێسیش خەریکی بازرگانی پارچە درومانیەکان مافوری سکوپچ بوو. کەواتە لە ژینگەیەکی خۆشگوزەران و ئارام، دوور لە هەموو جۆرە هەژاری و بێنەواییەک پەروەردە ببوو. بەمجۆرە، مەیلی ئایینی دایک و باوەڕی کچەکان بەچاکەکاری بوونە هۆی ئەوەی ئاگنێس و خوشکەکانی خەم لەهەژاران بخۆن. مادام تێریزا لە وتووێژەکانیدا لەگەڵ مالکۆم موگێریج (Malcolm Muggeridge) ئاماژە بە بیرەوەرییەکانی قۆناغی منداڵییەکەی دەکات و دەڵێت: «زۆربەی ئەو کەسە هەژارانەی لە سکوپچ و دەوروبەری دەژیان ماڵی ئێمەیان پێدەزانی و هیچ کەسێک بەدەستی بەتاڵەوە لەماڵەکەمان نەدەگەڕایەوە. هەموو رۆژێ لە سەرمێزی نان خواردن چەند میوانێکمان هەبوون. سەرەتا لە دایکمم دەپرسی ئەوانە کێن، و دایکم دەیگوت هەندێکیان خزمن، بەڵام هەموویان هاونیشتمانی ئێمەن. چەند ساڵێک دواتر کاتێ گەورە بووم، تێگەیشتم کە ئەو بێگانانە ئەو هەژارانە بوون کە شتێکیان نەبوو بیخۆن و دایکم خواردنی پێدەدان.»[٧٠]

«چاکەکاری مەسیحیانەی درانای دایکم بەمە تەواو نابێت. ئەو هەمیشە چاودێری دراوسێیەکی هەمیشە مەست (مزمن)ی ئێمەی دەکردو رۆژێ دووجار خواردنی بۆ ئەو ژنە دەبرد. لەم نێوەشدا باوەڕەکەی بە منداڵەکانی ئەو ژنە دەگەیاندە. هەموو شەوێک گشت تاکەکانی خێزانەکەمان بۆ دوعاو پاڕانەوە لەساڵۆنەکەدا کۆدەبوونەوە. هەموو یەکشەممەیەکیش، ئاگنێس و ئەندامەکانی تری خێزانەکەی بەشدارییان لەرێوڕەسمی شیوی شەوانی رەبیانی کەنیسەی ساکرەکۆر (Sacr  Coeur)دا دەکردی کە لەلایەن باوکە یانبری کۆڤیچ (Janbren Kovic) ساز دەکرا. ئەم قەشە یەسووعییە یەکەم کەس بوو کە روحانییەتی بۆ ئەو ئاشکرا کرد ئاگنێس لە رێی ئەوەوە بە



سەرگوزشتەی موژدەهێنەرە یەسووعییەکان کە بەجیهاندا دەگەڕان تا یارمەتی هەژاران بدەن ئاشنابوو. لەپاش خوێندنەوەی ئەم چیرۆکە، ئاگنێس بۆ یەکەمین جار هەستی کرد کە حەز دەکات خزمەتی خوا بکات و هێز و توانای خۆی  لە خزمەت کردن بەوانی تر بخاتەکار. بەم شێوەیە ئاگنێس لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا ژیانی ئایینی هەڵبژاردو بڕیاری دا بچێتە لای خوشکانی نۆترە دام دولۆرێتۆ (Notra Dame de Loreto). لە ٢٥ی ئەیلوولی ١٩٢٨ بە نەمسا، سوێسرا، فەڕەنسا، ئینگلتەرادا تێپەڕی تا گەیشتە دبلن و پەیوەندی بە کۆمەڵەی رەبەنەکانی کەنیسەوەکرد. لە ماوەی شەش هەفتەدا تا رادەیەک فێری زمانی ئینگلیزی و بۆ خوێندنی ئایینی ئامادە بوو. لە دووی کانوونی یەکەمی ١٩٢٨، ئەوروپای بەجێهێشت، تا لە هیندستان نیشتەجێ بێت. لەوێ بۆ یەکەمین جار بە هەژاری ئاشنابوو و لە نامەکانیدا هیندستانی بە وڵاتێک وەسف کرد کە دووچاری هەژارییەکی بێ وێنە هاتووە [کە] زۆربەی خەڵکی، لەسەر شەقامەکان، کەنار دیوارەکان یاخود لەسەر رێگاکاندا ژیان دەبەنەسەر. شەو و رۆژیان لەوێ لەسەر پارچەیەک حەسیر یان لەسەر زەوی بەسەر دەبەن. سەراپا رووتن. ئەوانەی کە رەوشێکی باشتریان هەیە، پارچەیەک قوماشیان بەدەوری کەمەریان وەرپێچاوە کە لەجیاتی پۆشاکە.»[٧١]

لە ٢٣ی مارسی ١٩٢٩ ئاگنێس چووە دارجلینگ لەبناری چیای هیمالایا و لەوێ وەک قوتابییەکی نوێ وەرگیرا. دوو ساڵ دواتر لە ١٩٣١، جلی ئایینیی پۆشی و ژیانی ئایینیی هەڵبژارد. لەبەر قەشە تێریزا دو لیسیو (Sainte Therese de Lisieux) ناوی لە خۆی نا تێریزا. ئەوکات بۆ ماوەیەکی کورت لە بەنیگال نیشتەجێ بوو و دەستی کرد بە کارکردن لە نەخۆشیخانەیەکی خەیریدا. پاشان گەڕایەوە کلکتە تا درێژە بەخوێندنەکەی بدات، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم داوای لێکرا وەک مامۆستا لە کۆلێژی سانت ماری زیاتر لە ٣٠٠ کچ پەروەردە بکات. بەڵام لەبەر سەربەخۆیی

هیندستان و زۆربوونی ژمارەی پەناهەندەکان لە کلکتە، مادام تێریزا بڕیاریدا کۆلێژ بەجێ بهێڵێت و دەست بکاتەوە بەژیان لەنێو هەژاراندا. لە کاتی سەفەرکردنی و بۆ دارجلینگ بە شەمەندەفەر، بۆ یەکەمین جار بانگەوازی خوای بیست کە فەرمانی پێدەکرد واز لە نەوسک (خەڵتوەتخانە) بهێنێت و یارمەتی هەژاران بدات. چەند ساڵێک دواتر دەڵێت: «دەچوومە دارجلینگ، لە شەمەندەفەرەکەدا دەنگێکم بیست، و داوای لێکردم واز لە هەموو شتێک بهێنم و لە دوای ئەوەوە بچمە ئەشکەوتەکان و یارمەتی هەژاران بدەم. زانیم کە ویستی خوایەو پێویستە پەیڕەوی بکەم.. پەیامێکی تابڵێی ئاشکرابوو. من دەبوو واز لە نەوسک بهێنم و لەگەڵ هەژاران دەست بەکار و ژیان بکەم. ئەمە فەرمان بوو دەمزانی وابەستەم بەکوێوە، بەڵام نەم دەزانی چۆن پێی بگەم.»[٧٢] لە نیسانی ١٩٤٨ مادام تێریزا لە لایەن ڤاتیکانەوە ئیجازەی پێدرا کۆمەڵەی خوشکانی لۆرێتۆ بەجێ بهێڵێت و خۆی بۆ هەژاران تەرخان بکات. بەم شێوەیە لەتەمەنی ٣٨ ساڵیدا، جلی ئایینیی خستەلاوەو لە جیاتی ئەوە سارییەکی سادەی شین و سپیی لەبەرکرد.

لەگەڕانەوەدا بۆ کلکتە، لەپاش سێ مانگ نیشتەجێبوون لە پاتنا (Pat-na) لەگەڵ دەستەیەکی پزیشکی «کەنیشکە بچکۆڵەکانی هەژاری»، لە خانوویەکدا نیشتەجێ بوو کە دەکەوێتە شەقامی کریک و ژمارەی ١٤ بوو. ئەم خانووە هی کاسولیکێکی بەرەگەز بەنیگالی بوو. لەوێ خۆی لەنێو قوتابیە کۆنەکانی کۆلێژی سانت ماریدا بینیەوە کە ئامادەبوون لەهاوکاری کردنی هەژاراندا یارمەتی بدەن. بەم شێوەیە لە حەوتی تشرینی یەکەمی ١٩٥٠، کۆمەڵەی مزگێنیدەرانی چاکەکارییان دامەزراند. لە هەمان ساڵدا تەبەعیەتی وڵاتی هیندستانی قبوولکرد. باوکە جولین هێنری و باوکە ڤان ئێکزمی پەیڕەو و پرۆگرامی کۆمەڵەکەیان دادەڕشت. ئەوان لەسەر داوای دایکە تێریزا بۆ سێ پەیمانی داوێن پاکی، هەژاری و فەرمانبەری، پەیمانی



چوارەمیان «کاری خەیری بۆ هەژارترین هەژارەکان» زیادکرد.[٧٣]

لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا، کۆمەڵەی مزگێنیدەرانی چاکەکاری لە رووی چالاکی و ژمارەی ئەندامانیەوە پەرەی سەند. لەکاتێکدا کە هەژارو نەخۆشەکان رۆژانە زیاد دەبوون، بە دەیان خوشک لە هەموو شوێنێکەوە هاتن بۆ یارمەتیدانی دایکە تێریزا لە کارەکەیدا.

یەکەمین هەنگاوی مرۆڤدۆستانەی دایکە تێریزا دامەزراندنی خانەیەک بوو بۆ ئەو کەسانەی لەسەرەمەرگدان (Nirmal Hirday) لە ساڵی ١٩٢٥ لە گەڕەکی خان لیڤات. مادام تێریزا، لە دوای هاوکاریکردنی ژنێک کە لەسەرەمەرگدابوو، بڕیاری دامەزراندنی ئەو خانەیەی دا. لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ مالکۆم مۆگریج دەڵێت: «مشک و مێروولە دەمیان ژەنیبووە لاشەیەکەوە. لە باوەشم گرت و بردمە نەخۆشخانە، بەڵام گوتیان ناتوانن شتێکی بۆ بکەن. لەبەر ئەوەی نەرۆیشتم، ناچار چاودێرییان کرد. یەکسەر گەڕامەوە ماڵ و داوای شوێنێکم کرد کە بتوانم کەسی وەها ببەمە ئەوێ، چونکە لەهەمان رۆژدا کەسی ترم لە شەقامدا بینی کە لەسەرەمەرگدابوون. کارمەندی بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی منی بردە پەرستگای کالی و شوێنی پشووی سەردانیکەرەکان «domrasalah»ی پێ نیشاندام. خانوویەکی بەتاڵ بوو و ئەوێی پێشنیارکرد. لەبەر چەند هۆیەک خۆشحاڵ بووم، بە تایبەتی لەبەر ئەوەی کە ئەوێ بۆ هیندییەکان ناوەندی زوهدو داوێن پاکی بوو. لە ماوەی کەمتر لە ٢٤ کاتژمێر دەست بەکار بووین بۆ یارمەتیدانی نەخۆشەکان و ئەوانەی لەسەرەمەرگدان. لەو رۆژە بەدواوە، زیاتر لە ٢٣٠٠٠ کەسمان لەشەقامەکانی کلکتە کۆکردەوە کە نیوەیان گیانیان بەخشی.»[٧٤]

بەڵام کاری دایکە تێریزا بەمە کۆتایی نایەت. ئەو بە گیانی چاکەکاریی مەسیحییەوە یارمەتیی ئەوانەی دا کە دووچاری «گرووبوون» هاتوون و بەیارمەتی حکومەتی هیند و خەڵکی کلکتە (Shanti Nagar) «شارۆچکەی

ئارامی» دامەزراند کە بووە ناوەندێک بۆ یارمەتیدانی نەخۆشە «گڕووبوو»ەکان. بەهۆی ئەم دروشمەوە: «بەهاودڵییەوە دەست بە گڕوودا بهێنە. بە خۆشەویستی دەست بە گڕووییدا بهێنە.»

بە هەمان روحییەتەوە دایکە تێریزا بڕیاریدا پەروەردگایەک (Nirmala Shishu Bhavah) بۆ منداڵە بێ سەرپەرشتەکان دامەزرێنێت. بەم شێوەیە خوشکانی چاکەکاری هەزاران منداڵیان لە شەقامەکان کۆکردنەوەو بردیانە پەروەردگاکە تاکو بەهرەمەندبن لە خوشەویستی و پەروەردە. بەم شێوەیە قۆناغ بە قۆناغ و رۆژ لە دوای رۆژ کاری دایکە تێریزاو هاوکارانی لە جیهاندا دەنگی دایەوە. پاپا پۆلی شەشەم لە ساڵی ١٩٧١ خەڵاتی ئاشتیی جۆنی سێزدەیەمی بە دایکە تێریزا بەخشی. لە ساڵی ١٩٧٩ خەڵاتی نۆبلی ئاشتی وەرگرت. تا ئەوکات، نزیکەی دوو سەد ناوەند لە جیهاندا بەدەستی مادام تێریزا دامەزرابوون. کەواتە، چالاکییەکانی دایکە تێریزا زیاتر لە جاران رەهەندی جیهانیان وەرگرت. بەدەوری جیهاندا گەڕا تاکو یارمەتی هەژار، دەرکراو و پەناهەندەکان بدات. لە ١٩٧٠ سەردانی عەمانی کرد تاکو پەلە لە یارمەتیدانی فەڵەستینییەکان بکات. لە ١٩٧٧ بۆ گواتیمالاو لە ١٩٨٢ چووە بەیروت. لەسەرەتاکانی ساڵی دا١٩٨٠، بڕیاریدا خەریکی نەخۆشەکانی ئایدز بێت. بەم پێیەش چاوی بەهەموو سیاسەتمەدارانی جیهان کەوت و داوای یارمەتی لێکردن، تەنانەت پاپا شوێنێکی لەشاری ڤاتیکان خستەبەر دەستی تا ئاوارەکانی تێدا بحەوێنێتەوە. لەسەرەتاکانی ساڵی ١٩٩٠ دایکە تێریزا بڕیاریدا سەرپەرشتی کۆمەڵەکە بە کەسێکی گەنجتر بسپێرێت، بەڵام جارێکی تر لەلایەن خوشکان هەڵبژێردرایەوە، تا ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٩٦، ساڵێک پێش مردنی، لەبەر نەخۆشی دەستی لە کار کێشاوەو خوشکە نیرمالا (Nir-mala)ی لە شوێنی خۆی دانا. بەڵام تا دوا رۆژی ژیانی، عاشقانە خۆی بۆ هەژارو دەرکراوەکان تەرخانکرد. ئەو لەبارەی کارەکەیەوە گوتی: «ئێمە



کرێکار یان خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی نین. دەمانەوێ شادی و ئەوینی خوا بەخەڵکی ببەخشین، خوا خۆی لە رێگەی ئێمەوە خۆشەویستیان پێدەبەخشێت. لە هەمان کاتدا ئێمەش خوامان خۆشدەوێت و لە خزمەتکردن پێی لە رێگەی یارمەتیدانی هەژاران خوشەویستیەکەمان دەردەبڕین. زۆر دامەزراوە هەن کە چاودێری هەژاران دەکەن. ئێمە نامانەوێت یەکێک بین لەوان، ئێمە دامەزراوەیەکی خەیری یاخود خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتی ئاسایی نین. دەمانەوێت زیاتر بین لەوە، زیاتر خزمەت بکەین؛ پێویستە یارمەتی خۆمان بدەین. پێویستە بە خزمەتکردنی خۆمان، خۆشەویستی خوا پێشکەش بە مرۆڤەکان بکەین. لە راستیدا هەژاران فێریان کردووین کە خۆشەویستی مانای چییە، لەگەڵ ئەوەی کە تەنیا لە پاش مردن بە تەواوی لێی تێدەگەین.»[٧٥]

دایکە تێریزا ژنێکی ئەهلی کار و قسە بوو. کەواتە پێویستە سەرنج بدەینە ئەو پەیڤانەی کە ئەو بەکاری دەهێنان. لەبەرامبەر ئەو واقعە بی بەزەییە کە رووبەڕووی دەبووەوە، زیاتر لەوەی پەیڤی چالاکیی ئایینی بەکار بهێنێت، بە بەردەوامی وشەگەلێکی وەک چاکەکاری، باوەڕ، خۆشەویستی و هی تر بەکاردێنێت. ئەم پەیڤانە لایەنی خواناسییان هەیە و پێویستە لە پەیوەندیانەوە بە رەفتاری مەعنەوی دایکە تێریزا لەبەرچاو بگیرێن. چونکە دایکە تێریزا کارێکی سادەی خزمەتگوزارێکی کۆمەڵایەتی ئەنجام نادات. بەڵکو بەدوای مرۆڤایەتییەکی نوێ دادەگەڕێت و بەهەمان شێوە هەوڵدەدات وەفاداری و پابەندیی خۆی پیشانی ئەو لایەنە بدات کە ئازایەتیی پێویستی بۆ کارێکی ئاوا پێ بەخشیوە. کەواتە بۆچوونی دایکە تێریزا کار کەرەستەی خۆشەویستیی خوایە. رێگایەکە بۆ زیاتر نزیکبوونەوە لە خوا. کەواتە لە رێی کارکردن لەگەڵ هەژاران و ژیان لەنێوانیاندا، هەست دەکات لە خوا نزیک بۆتەوە . دایکە تێریزا دەڵێت: «لە راستیدا، ئێمە لە بوونی کەسی هەژاردا، هەست بە پەیکەری مەسیح

دەکەین، مەسیحی برسی تێردەکەین، مەسیحی رووت پۆشتە دەکەین و مەسیحی بێ پەنا، پەنا دەدەین.»[٧٦] بە چاوی دایکە تێریزا، تاکی هەژار، گرووپ یاخود لەسەر گیانەلا هەموویان بە جۆرێک لە جۆرەکان نیشاندەری مەسیحن، چونکە بە گۆتەی ئەو: «مەسیح بەشێوەی گۆڕاو خۆی پیشانمان دەدات.»[٧٧] کەواتە مەسیح کەسێک نییە لە بەرامبەر ئێوە بێت، لەتەک ئێوەدایە، هاوچەشن و دراوسێی ئێوەیە، کە پێویستە خۆشەویستی و هاودڵیی پێشکەش بکەیت. بە بڕوای دایکە تێریزا مانای مەسیح لە پەیامی خۆشەویستییەکەیدایە کە: «خۆشەویستی میوەی هەموو وەرزو هەموو کاتەکانە و لەبەردەستی هەموانە.»[٧٨] کەواتە، با وەک مەسیح، ئەم میوەیە بڕنین و بخەینە بەردەستی ئەوانی ترەوە. بەم شێوەیە بە بڕوای دایکە تێریزا، لە جیهانێکدا کە خۆپەرستی تیادا فەرمانڕەوایە، عیسا پێشوەچوونێکی ترمان بەبیر دەهێنێتەوەو بەهێزی خۆشەویستی رکابەرایەتی توندوتیژی دەکات. کەواتە خاچی عیسا تەرازووی پێوانی خواییە بۆ ئەم خۆشەویستییە.

لە قسەکانی دایکە تێریزادا، خاچی عیسا یەکەمین پایەی خۆشەویستییەو هەروەها سەبارەت بە هەژاران سەرچاوەی دەروەستەییە. خاچی مەسیح هەم نیشاندەری رەنجی مرۆڤەو هەمیش نیشاندەری میهرەبانیی خواییە. نیشانەیەکە لە خۆشەویستی و قوربانیدان. بەگوتەی دایکە تێریزا: خۆشەویستیی زیندوو مایەی ئازارە. عیسا بۆ سەلماندنی خۆشەویستیەکەی بۆ ئێمە، گیانی لەسەر خاچ بەخشی. دایک، بۆ لەدایک بوونی منداڵەکەی، پێویستە زەحمەت بکێشێت. ئەگەر بە راستی یەکترتان خۆشدەوێت، پێویستە خۆبەختکەر بن.»[٧٩] بۆ ئەوەی وەکو مەسیح بین، پێویستە وەکو ئەو زەحمەت بکێشین. پێویستە بزانین کە چۆن خاکەڕایانەو شادومانانە خاچ لە ئامێز بگرین. خاچ ئەو شتە ئاشکرا دەکات کە مەسیح لە پێناوی خۆشەویستی مرۆڤەکاندا دەیویست تاکوێ بەرەوپێش بچێت.



سەرەڕای ئەوەش رەنجی مەسیح نیشاندەری رەهەندی دیکەی خۆشەویستییە کە مرۆڤ دەیانناسێت. رەنجێکی رزگارکەرە. بە بۆچوونی دایکە تێریزا، رەنج بە هۆی و لە پێناوی باوەڕدا رێگایەکە بۆ نزیکبوونەوە لەو هەموو کەسانەی کە لە ئاوارەیی و هەژارییدا زەحمەت دەکێشن. بە گوتەی ئەو: «رەنج خۆی لە خۆیدا شتێک نییە؛ بەڵام ئەو رەنجەی کە کارەساتی مەسیحی تێدا بێت دیارییەکی سەیرە. جوانترین دیارییەک کە بە مرۆڤ بەخشراوە ئەوەیە کە دەتوانێت بەشدار بێت لە کارەساتی مەسیحدا. بەڵێ دیاری و نیشانەیەکە لە خۆشەویستییەکەی. چونکە ئەوکاتەی کە باوک مردنی کوڕەکەی لە پێناو ئێمەدا هەڵبژارد، خۆشەویستییەکەی بۆ خەڵکی جیهان ئاشکرا کرد.»[٨٠]

کەواتە، بە بۆچوونی دایکە تێریزا خزمەتکردنی هەژاران رێگایەکە بۆ ئەوەی ئەوینی خواییان پێشکەش بکەین. هەروەها تەنیا رێگایەکە کە بە خوا دەگات. بە بڕوای دایکە تێریزا هەر دوو فەرمانی: خۆشویستنی خواو خۆشویستنی خەڵک یەکن. خۆشویستنی ئەویتر خۆشویستنی خوایەو خۆشویستنی خوا خۆشویستنی ئەویترە، بەڵام مەبەست لەوی تر کۆمەڵێکی زۆر نییە. چونکە بۆ خۆشویستنی تاکێک، پێویستە دەست بە رووخساریدا بهێنین و لە چاوەکانی بڕوانین. کەواتە بەهەمان شێوە کە دایکە تێریزا دەڵێت: «ئەوەی گرنگی بۆ ئێمە هەیە تاکەکەسە. بۆ خۆشویستنی تاکێک، پێویستە لێی نزیک ببینەوە. ئەگەر رووبەڕووی خەڵکانێکی زۆر هاتین، لەنێو زۆراندا بزر دەبین و هەرگیز ناتوانین پابەند و خۆشەویستیمان بۆ تاکێکی دیاریکراو دەرببڕین. بەلای منەوە هەر تاکێک لە تاکەکەسانی کۆمەڵگا مرۆڤێکی تاقانەیە.»[٨١] پێشکەشکردنی خۆشەویستی بە کەسێک کە پێویستی پێیەتی، پەیامی مادام تێریزایە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لە سەفەرەکانیاندا رووبەڕوویان دەبێتەوە. وەک وتمان، بە بۆچوونی ئەو وشەی خۆشەویستی لە نیەت چاکییەکی سادە زیاترە.

مەبەست لەم وشەیە، خۆشەویستی خوایە کە لەسەر دڵی مرۆڤ دەنیشێت. هەر لەبەر ئەوە لە نەبوونی ئەم خۆشەویستییەدا، هەر کارێکی کە ئەنجامدەدرێت جۆرە کۆیلایەتییەکە. ئەو دەڵێت: «مەبەستمان کار نییە، پابەندبوون بە کارە سادەکان رێگەیەکە بۆ ئەوەی خۆشەویستییەکەمان چالاک بکەین.» هەروەها درێژە پێدەدات: «جیاوازی کاری ئێمە لەگەڵ خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە ئێمە بۆ خۆشەویستنی خوا بەبێ چاو لە هیچ بوون خزمەت دەکەین.»[٨٢] تەنانەت هەندێ جار دایکە تێریزا لە روونکردنەوەی قسەکانیدا وتەکانی حەزرەتی عیسای دەگێڕایەوە: «ئەو کارەی کە بۆ بچووکترین براکانتان کردووە، کارێکە بۆ منتان کردووە.» بەم شێوەیە لە رووخساری مەسیحدا لە مانای ئەو خۆسەویستییە تێدەگەین، ئەو خۆشەویستییەی کە بەموڵکایەتی ناکرێت، بەڵکو دەبەخشرێت. کەواتە خۆشەویستییەکی بێ واستەیە، چونکە لەدڵێکەوە دەنیشێتە سەر دڵێکی تر. سەرەڕای ئەوەش خۆشەویستی- کردەیە. بۆیە دەروەستەیی و بەرپرسیارێتی سەبارەت بە ئەوی تر دەهێنێتە ئاراوە. کەواتە دایکە تێریزا لە کردەی خۆیدا گیانی مەسیحییەتی بەرایی و هەروەها گیانی عاریفە مەسیحییەکانی وەک قەشە فرانسیس دەدۆزێتەوە کە دەڵێت تاکە رێگەی شیاو بۆ دەرخستنی باوەڕ، سەرنجدانی زۆرە لە کاروبارەکانی ئەم جیهانە. پاشان دایکە تێریزاش دەڵێت: «کەنیسە لەهەر یەکێک لە ئێمەدا، لە ناو من و لە تۆ دایە. ئێمە لەو کەسانەین کە پێویستە بزانن، خۆشیانبوێت و لە خزمەتی دەستکورتەکاندا بن.»[٨٣] بە بۆچوونی دایکە تێریزا، پەیوەندییەکەی نەپچڕاو لە نێوان کەنیسەو کۆمەڵگادا هەیە. ئەوە کۆمەڵ نییە کە ناچاری دەکات بۆ قسەوکردەوە، بەڵکو شتێکی هەمیشەییە لە ناوەندی هزری ئەودا، واتە دەروەستەیی خوا سەبارەت بەجیهان. سەرەڕای ئەوە خوا خۆی کۆمەڵگای مەسیحی ناچاردەکات بەرپرسیار بیت بەرامبەر بە ئەوانەی زەحمەتیان کێشاوە. سەرەڕای ئەوەی کە دایکە تێریزا باسی



ناتوندوتیژی و دادپەروەری نەکردووە یاخود کەم باسی کردووە، لەگەڵ هەموو ئەمەدا، بەکردەوە دوورەپەرێز لە توندوتیژییەکەی بەرگری لە هزری دادپەروەری کردووە. لە روانگەی ئەوەوە، نادادپەروەری لە دووشتدا کورت دەکرێتەوە: دەرکردنی ئەویترو خۆشنەویستنی. دەڵێت: «زەحمەت کێشانی جەستەیی زۆر سەختە، بەڵام لەوە مەینەتبارتر ئەوەیە کە حەزیان لە چارەی تاک نەبێت، خۆشیان نەوێت و دەری بکەن.»[٨٤] بەم شێوەیە بەبۆچوونی ئەو، دادپەروەری بێ خۆشەویستی ئاسان نییە. کەواتە، خۆشەویستی دراوێکی خواییە، چونکە خوا دادپەروەرە. هەموو مرۆڤەکان لەبەرامبەر خوادا یەکسانن. واتە ئەوەی کە خوا بەرپرس نییە لە نادادپەوەرییەکانمان. دایکە تێریزا دەڵێت: «خوا نیشانەی ئیخلاسە. باوەڕ ناکەم خوا بتوانێت لەکەسێک بێزاربێت. چونکە خوا خۆشەویستییە و سەرەڕای بێنەوایی و گوناهەکانمان ئێمەی هەر خۆشدەوێت.... خوا خۆشی دەوێت، چونکە خۆی خۆشەویستییە.»[٨٥] کەواتە بۆ ئەوەی لە خوا نزیک ببینەوە، پێویستە پاک و خاوێن بین. رێگای خۆ خاوێن کردنەوە پاڕانەوەیە، و بەردەوام دەبێت و دەڵێت: «پاڕانەوە دڵ وەها فراوان دەکات کە دیاریی خوا پەسند بکات.»[٨٦] کەواتە، پاڕانەوە دڵەکانمان دەکاتەوەو ئامادەی دەکات بۆ ئاشتی. چونکە «ئاشتی لە خودی ئێمەوە، لە دڵێکی پاکەوە. دڵێک کە بتوانێک خوا لە بوونی ئەوانی تردا بەدی دەکات.»[٨٧] بە بڕوای دایکە تێریزا، ئەو ئاشتییە لە سیمبۆلی بووناسییانەی هەژاریدا بەدی دێت و ئیمکانی پاڵپشتی ئەم خاڵە فەراهەم دەکات کە خوا بۆ خۆدەرخستن پاکترین تاک هەڵدەبژێرێت. هەژاری باشترین شوێنە کە ئەگەری ناسینی خوای تیادا ئاسانە. بەم شێوەیە، زەمینەی هەژاری دەبێتە شوێنی مەسیحاناسی. کەواتە بە رای دایکە تێریزا، ژیان لە نێو هەژاراندا بەجۆرێک لە جۆرەکان رەتکردنەوەی رق و هەروەها توندوتیژی و نادادپەروەریی دەرکردنی مرۆڤەکانە. خەباتی خۆ بەدوورگرتن لەتوندوتیژی

لە دژی نادادپەروەری لەرێی کارکردن لەسەر باوەڕو تەنانەت خزمەتکردنی خۆشەویستانەدا دەردەکەوێت. چونکە بە بڕوای ئەو، هەر جۆرە ئاشتییەکی راستەقینە پێویستی بە خۆشەویستی و ئاشتی و ئارامییە سەرەنجام بە بۆچوونی دایکە تێریزا، ئاشتی بەبێ خۆشەویستی و خۆشەویستی بەبێ ئاشتی مومکین نییە. ئەو لەسەرتاسەری ژیانیدا باسی ئەو دووانەی کردووە. مادام تێریزا لەمیانەی لاوازییەکان و ئەو هەڵانەی کەدانی پێداناون و توندوتیژییە دەرەکییەکان کە دامرکاندوونەتەوە، هەمیشە هاوکاریی مرۆڤەکانی کردووە بۆ ئەوەی واز لە خۆپەرستی و رق وکینە بهێنن تاکو باشتر بتوانن رەنجی ئەوانی تر درک بکەن. دایکە تێریزا لەبەر قوربانی دانی لە ژیانیدا بەقەدیس ناسرا، لە نێو ئەو مرۆڤانەدا کە خاوەن نەریتی ئایینیی جۆراوجۆرن، تا کۆتاییترین ساتی ژیانی رێگەی خۆشەویستی و عەشقی گرتەبەر.

**پەراویزەکان:**


1- Nelson Mandela: ((Now is the Time to Intensify the Struggle)) in *Nelson Mandela Speaks*, Pathfinder press, New York, 1993, p.28.

2- Nelson Mandela: ((Plaidoire au proc s de Rivonia)), in *L Apartheid*, aditions de Minuit, Paris, 1985, pp. 31-34.





3- Cit in K.K. Viranani: *Nelson Mandela and Apartheid in South Africa,* Kalinga Publications, New Delhi, 1991, appendix.

4- Nelson Mandela: *L Apartheid*, op. cit., p.96.

5- Ibid, p.29.

6- Ibid, p.45.

7- N. Mandela: *Long Walk to Freedom*, Little, Brown and Co., London, 1994. p.119.

8- Nelson Mandela: *L Apartheid*, op. cit., p.31.

9- N. Mandela: *Long Walk to Freedom*, op. cit., p.129.

10- N. Mandela: *L Apartheid*, op. cit., p.58.

11- cit in Jean Guiloineau: *Nelson Mandela*, Plon Paris, 1990, p.p. 193-194.

12- Cit in H.A.Jack: *The Gandhi reader*, New York Grove Press, New York, 1961, p.112.

13- M.L. King: ((Meet the Press)) 65/03/28, cit in Serge Molla: *Les id es noires de Martin Lu ther King*, Labor et Fides, Gen ve, 1992, p.p. 143-144.

14- Cit in Mary Benson: *Nelson Mandela*, Penguin Books london, 1986, p.190.

15- Nelson Mandela: Nelson Mandela Speaks, op cit. p.42.

16- Cit in Jean Guiloineau: *Nelson Mandela*, op, cit., p.221.

17- N. Mandela: *Long Walk to Freedom*, op. cit., p.272.

18- Nelson Mandela: *Mandela speaks*, op. cit., p.263.

19- Nelson Mandela: ((Press Conference in Cape Town 4 Mai 1990)) in *Selscted Speeches after his Release*, Kriptown Books, Lon-

don, 1990, p.46.

20- Ibid, p.70.

21- Ibid, p.97.

22- Ibid, p.83.

23- Ibid, p.84.

24- Noami Tutu: *The Word of Desmond Tutu*, Netmarket Press, 1989, p.93-94.

de Bou- 25- Desmond Tutu: *Hope and Suffering* cit in Shirley ley: *Desmond Tutu*, Centurion, Paris, 1989, p.113.

26- Cit in Hendrik J.C. Pietrse: *Desmond Tutu s Message* Deutcher Studien Verlag, Weinheim, 1955, p.88.

27- Desmond Tutu: *Hope and Suffreing* Skotaville Publishers, Johannesburg, 1983, p.141.

28- cit Par Bongamjab Goba: ((A Theological Tribute to Archbishop Tutu)) in *Hommering Swords in Ploughshares* Africa World Press, New Jersey, 1987, p.65.

29- Ibid, p.67.

30- Ibid, p.51.

31- Desmond Tutu: ((Discours dat de Jenvier 1976)), in Shrily de Boulay: *Desmond Tutu* op. cit., p. 138.

32- Desmond Tutu: ((Lettre a sa soeur Pauline dat e du 30 Janvier 1980)), in Shirley de Boulay: *Desmond Tutu*, op. cit., p.190.

33- Desmond Tutu: *Hope and Suffering* op. cit., P. 110.

34- Ibid, p.102.

35- Desmond Tutu: ((The Theology of Liberation in South Africa,))



in Dwight N. Hopkins: *Black Theology, U.S.A. and South Africa*, Orbis Books, New York, 1989, p.140.

36- Desmond Tutu: *Hope and Suffering*, op. cit., p.44.

37- N. Tutu: The *Words of Desmond Tutu*, op. cit., p.70.

38- Ibid, p.28.

39- Ibid, p.86.

40- cit in Shirley de Boulay: *Desmond Tutu*, op. cit., p.306.

41- Cit in Hendrik J.C. Pietrese: *Desmond Tutu s Message*, op. cit., p.92.

42- Desmond Tutu: *Hope and Suffering*, op. cit., p.143.

43- N. Tutu: *The Words of Desmond Tutu*, op. cit., p.27.

44- Desmond Tutu: *Hope and Suffering*, op. cit., p.68.

45- N. Tutu: *The Words of Desmond Tutu*, op. cit., p.74.

46- Claudine Vernier-Palliez et Benjamin Auger: *Le Dalai-Lama (La Pres snce et l Exil)*, editions J.C. Latt s, Paris, 1990, p.30.

47- Vijay Kranti; *Dalai-Lama Speaks*, Centrasia Publishing group. New Delhi, 1990, p.75.

48- His holiness the Dalai-Lama: *Essential Teachings*, Rupa & co. New Delhi, 1995, p.15.

49- Vijay Kranti: *Delai-Lama Speaks*, op. cit., p. 119.

50- Ibid, p.119.

51- Ibid, p.177.

52- Sa saintete le Dalai-Lama et J.C. Carri re: *La Force du Bouddhisme*, Robert Laffont Paris, 1994, p.182.

53- Ibid, p.181.

54- Ibid, p.104.

55- Ibid, p.25.

Publish- 56- Cit in P.N. Chopia: *The Ocean of Wisdom*, Allied
ers Private Limited. Ahmedabad, 1986, p.79-80.

57- Ibid, p.78.

58- Vijay Kranti: *Dalai-Lama Speaks*, op. cit., p.90.

59- His holiness the Dalai-Lama: *Essential teachings*, op, cit., p.14.

60- Cit in Calude B. Levenson: *The Dalai-Lama*, Unwin Hyman, London, 1988, P.264.

61- Vijay Kranti: *Dalai-Lama Speaks*, op. cit., p.66.

62- Sa saint te Le Dalai-Lama et J.C. Carri re: *La Force du Bouddhisme* op. cit., p.15.

63- Cit in Claude B.Levenson The Dalai- Lama, op. cit., p.212.

Harper 64- His holiness the Dalai-Lama: *The Way to Freedom*,
Collins Publishers India, New Delhi, 1995, p.94.

65- His holiness the Dalai-Lama: *Essntial Teachings* op. cit., p.17.

66- Claudine Vernier-Palliez et Benjamin Ager. *Le Da lai Lama* (*La Pr sence et l Exil*), op.cit., p.112.

67- Ibid, p.116.

68- Cit in P.N. Chopra: *The Ocean of Wisdom*, op. cit., p.68

69- Discours du Dalai-Lama dat du 10/03/1997, cit in internet.

70- cit in Raoger Royle: *Mother Teresa*, Bloomsbury, London, 1992, p.10.

71- Cite in Le *Monde dat* de 8 Septembre 1997.

72- cit in Roger Royle: *Mother Teresa*, op. cit., p.21.



73- Ibid, p.29.

74- Malcolm muggeridge: *Something Beautiful for God*, collin, London, 1971, p .91.

75- voir l internet.

76- Mother Teresa: *A Gift for God*, Harper and Row Publishers, New York, 1975, p.39.

77- Mother Teresa: *A Life for God*, Harper collins Publishers London, 1995, p.45.

78- Mother Teresa: *A Gift for God*, op, cit., p. 67.

79- Ibid, p.13.

80- Ibid, p. 20.

81- Mother Teresa: *A Life for God*, op, cit., p. 233.

82- Mother Teresa: *A Gift for God*, op, cit., p. 205.

83- Ibid, p. 104.

84- Cit in *La Monde* dat de Lundi 8 September 1997.

85- Mother Teresa: *A Gift for God*, op, cit., p. 37.

86- Malcom Muggeridge: *Something Beautiful for God*, op. cit., p. 66.

87- Mother Teresa: *A Life for God*, op. cit., p. 17.

## کەسایەتییەکان

### ئەدۆلفۆ پیریز ئیسکویڤێل

ئەدۆلفۆ پیریز ئیسکویڤێل (Adolfo Perez Esquivel) لە ساڵی ١٩٣١ لە ئەرجەنتین لە دایک بووە. باوکی پەنابەرێکی ئیسپانی و دایکی بەرەچەڵەک پاراگوایی بوو. خوێندنی لە قوتابخانەی نەتەوەیی هونەرە جوانەکانی مانوێل بێلگرادۆ (Manuel- Belgrado ) و زانکۆی پلاتا (Plata) بە ئەنجام گەیاند، و بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ وەک مامۆستای پەیکەرتاشی لە ئامادەیی و زانکۆدا خزمەتی کرد.

لە ساڵانی ١٩٦٠دا، دەستی کرد بە هاوکاریکردنی ئەو رێکخراوە مرۆییانەی چالاکیان لە بواری ناتوندوتیژیدا لە ئەمریکا لاتینی دەنواند. لە ساڵی ١٩٧٤ بە رێکخەری گرووپەکانی تایبەت بە ناتوندوتیژی لە ئەمریکای لاتین هەڵبژێردرا. لە دوای ئەوەی چاوی بە جێن و هێلگارد گۆس (Jean et Hildegarde Goss) کەوت بڕیاریدا بەشداری لە دامەزراندنی SERPAJ (سرڤیسی ئاشتی و دادپەروەری)دا بکات. لە ساڵی ١٩٧٤ تاکو ١٩٨٦ بەرپرسێتی هەماهەنگی ئەم سرڤیسەی لە ئەستۆ بوو. کاری ئەم سرڤیسە دروستکردنی پەیوەندی بوو لە نێوان رێکخراوە مرۆڤ دۆستەکان و خێزانی قوربانییانی دیکتاتۆری ئەرجەنتین. خەباتی پیریز ئیسکویڤێل بۆ ئازادی ئەرجەنتینییەکان بووە هۆی ئەوەی لە ساڵانی ١٩٧٦، ١٩٧٧بخرێتە زیندانەوە. پیریز لە ساڵی ١٩٨٠ خەڵاتی نۆبلی ئاشتی وەرگرت. ئەمڕۆ ئەدۆلفۆ پیریز ئیسکویڤێل ئەندامی





ئەنجومەنی نێو نەتەوەیی هێزە ئاشتی پارێزەکانی جیهان و سەرۆکی فەخریی سرڤیسی ئاشتی و دادپەروەری ئەمریکای لاتینە.

### دۆم هێلدەر کامارا

دۆم هێلدەر کامارا (Dom Helder Camara) لە ساڵی ١٩٠٩ لە فۆرتالێزا (Fortaleza) لە بەرازیل هاتە دنیاوە. لە ساڵی ١٩٣١ بە پلەی قەشایەتی گەیشت و چەند ساڵێک دواتر، لە میانەی کۆڕی شیوی پەروەردگاری دا بە هەژاری «Favellas» ئاشنابوو. لەو کاتەوە، بەردەوام بوو لەسەر فێرکردنی هەژاران و خەباتی خۆبەدوورگیر لە توندوتیژی لە دژی نادادپەروەریی کۆمەڵایەتی. هەروەها وەک ئەسقەفی شاری رێسیف (Recife) لە باکووری رۆژهەڵاتی بەرازیل، بۆ پێشکەوتن و گەشەسەندنی شارەکە تێکۆشا. لە ساڵی ١٩٨٠ لەگەڵ ئەدۆلفۆ پیریز ئیسکوێڤێل، خەڵاتی نۆبلی ئاشتی وەرگرت.

### رێگۆبێرتا مەنچو توم

خاتوو رێگۆبێرتا مەنچو توم (Rigoberta Menchu Tum) لە ساڵی ١٩٥٩ لە شاری شیمێل (Chimel) لە گواتیمالا چاوی بە جیهان هەڵێنا. هەرگیز نەچووە قوتابخانە. لە گەنجێتیدا دوو لە براکانی گیانیان لەدەست دا. بۆیە پێویست بوو وەک ئافرەتێکی پێگەیشتوو لێپرسراوەتییان لە ئەستۆ بگرێت. پاش بەشداریکردنی لە رێوڕەسمێکدا پەیمانیدا خزمەتی کۆمەڵگا بکات. لەو کاتەوە هەڵسا بە سازدانی چەند کۆنفرانسێک. لە ساڵانی دەوروبەری ١٩٧٠، لەگەڵ باوکی لە کۆمیتەی یەکێتی کامپێسینۆ (Compesino) زۆر چالاکی ئەنجام دا. ئەم کۆمیتەیە بۆ پارێزگاریکردن لە کێشەی جوتیاران دامەزرا بوو. هەر لە هەمان ئەو کاتانەدا بوو کە باوکیان رفاند و ئەشکەنجەیاندا. بۆیە بڕیاریدا جێگەی باوکی بگرێتەوەو بەردەوامی بە چالاکییەکانی ئەو بدات. لە پاش مردنی باوکی،

چالاکییەکانی خۆی لە کۆمیتەی یەکێتی کامپێسینۆ (C.U.C)دا زیاتر کردن. لە کانوونی دووەمی ١٩٨١دا پەیوەندی بە گرووپێکی ترەوە کردو لەدژی حکومەتی گواتیمالا مانی دەگرت. بەڵام گیان لە مەترسیدا بوو. بۆیە بەرەو مەکیسک بە ڕێ کەوت و بە هاوکاری ئەوانی تر کتێبی «ئافرەتی سوور پێست لە گواتیمالا» (Une femme in-dienne au Guate-smala)ی بڵاوکردەوە. پێشوازیەکی زۆر لەم کتێبە کراو بەڵگەیەکی واقیعی بوو لەسەر چالاکی خۆپارێزانەی ڕێگۆبێرتا لە ڕێگەی بەرەو پێش بردنی مافی ڕەشۆکییەکان. ئەو لە ساڵی ١٩٩٢ خەڵاتی نۆبلی ئاشتی وەرگرت. لە ساڵی ١٩٩٣، لە لایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان(UN)وەک بالوێزی نیەتپاکی لە دەیەی نێو نەتەوەیی ڕەشۆکییەکان دامەزرا، و ئێستا پارێزەری دەیەی نێونەتەوەیی ڕەشۆکییەکانە.

### موبارەک ئاواد

موبارەک ئاواد(Mubarak Awad) لە ساڵی ١٩٤٨ لە قودس لە دایک بووە. باوکی لە جەنگدا گیانی بەخشی. لە پاش خوێندنی لە قوتابخانەی سان جۆرج لە قودس، بۆ خوێندنی ئیلاهیات نێردرایە وڵاتە یەکگرتووەکان. لە تێنسی و ئۆهایۆش وەکو قودس، کەوتە ژێر کاریگەریی ئاشتیخوازیی مێنۆنیت وکواکرەکان (Mennonites and Quakers). وەک مامۆستا لە قوتابخانەی مێنۆنیت لە قودس دەست بەکاربوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٦٩دوور خرایەوە وسەرەنجام بە بیروباوەڕی ناتوندوتیژییەوە گەڕایەوە زێدەکەی. لە ١٩٨٥سەنتەری فەڵەستینی بۆ لێکۆڵینەوەی ناتوندوتیژی دامەزراندو وەک بەڕێوەبەری ئەو سەنتەرە چالاکی دەنواند.



### ئێلیاس شەکوور

قەشەی کاسولیکی ملشیت (Melchit)، فەڵەستینیە. لە کاتی



گەنجێتیدا لە گوندە زێدەکەی بیران (Biran) دەرکرا و گرووپە ئیسرائیلییەکان زەوییەکانی باوکی ئێلیاس شەکوور (Elias Chacour)یان وێران کردن. لە دوای خوێندنی لە فەڕەنسا ناسیاوی لەگەڵ رایا (Raya)ی پایەبەرز پەیا کرد کە ئەویش مارتین لۆتەر کینگی دەناسی، ئێستا لە سەنتەری فرە ئایینی (CRP)، لە کۆلیجی مار ئێلیاس لە شاری جەلیلیە کاردەکات. ئەو ناوەندە وتووێژی نێوان سێ ئایینی گەورەی ئیبراهیمی دروست دەکات و هەوڵی بەرەو پێش بردنی ئاشتی لە نێوان فەڵەستینییەکان و ئەوانی تردا دەدات.

## بزاڤەکان

### بزاڤی ڕێگای ناتوندوتیژی

بزاڤی ڕێگای ناتوندوتیژی (MAN) لە ڕووی هزر و کردەوەوە بزاڤێکی سیاسییە، کە لە لایەکەوە لە میانەی فەلسەفەی ناتوندوتیژی و ڕاڤەکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لێکۆڵینەوەی تیۆری ئەنجام دەدات، لە لایەکی ترەوە لە ڕێگا تایبەتییەکانی ستراتیجییەتی ناتوندوتیژییەوە چالاکی دەنوێنێت تا کۆمەڵگایەک لەسەر بنچینەی دادپەروەری و ئازادی دامەزرێنێت.

### هێزە ئاشتی پارێزەکانی جیهانی

ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٨١، بە ئیلهام وەرگرتن لە ڤینوبا، کە یەکێک بوو لە دەروێشەکانی گاندی و لە ساڵی **١٩٥٢** سوپای ئاشتی (Shanti Same)ی دامەزراندبوو، لە کەنەدا دامەزرا.

هێزە ئاشتی پارێزەکانی جیهان (BPI) ڕێکخراوێکی خەباتگێڕ و لە جۆری خۆیدا تایبەتییە کە چەند ئاراستەیەکی خۆبەدوورگیرانە لە توندوتیژی بە مەبەستی پاراستنی ئاشتی و پاراستنی مافی مرۆڤ تاقی دەکاتەوە، و پراکیتزەیان دەکات. ڕێکخراوی BPI خۆبەخشەکان بۆ ئەو ناوچانەی کە ڕووبەڕووی سەرکوتکردنی سیاسی بوونەتەوە دەنێرێت. هەروەها بەرگری لەو تاک و ڕێکخراوانە دەکات کە کەوتوونەتە بەر مەترسی توندوتیژی سیاسییەوە. ئەم بەرگری لێکردنە بە شێوەی جۆراوجۆر ئەنجام دەدرێ. پارێزگاری تاکەکەسی، ئامادەبوون لە نووسینگەی ئەو



ڕێکخراوانەدا کە کەوتوونەتە بەر هەڕەشەوە، بەڕێکردنی پەناهەندەکان لە ڕێگای گەڕانەوەدا، چاودێریکردنی نێو نەتەوەیی لەسەر هەڵبژاردنەکان و تد... سەرەڕای ئەم پارێزگاری لێکردنانە، تاکەکان فێرە ناتوندوتیژی دەکات و پێکدادانەکان لە ڕێگای بڵاوکردنەوە و پەخشکردنی بڵاوکراوە لە بواری ئاشتیدا. ئەندامەکانی ئەم ڕێکخراوە، لە ڕێڕەوی هەوڵەکانیانەوە دەریانخستووە کە ئەو کەسانەی بە کۆمەڵ چالاکی دەنوێنن لە توانایان دایە بە شێوەیەکی کاریگەر لە پاراستنی ئاشتیدا دەور ببینن.

### ناوەندی فەڵەستینیی تۆژینەوەی ناتوندوتیژی

ناوەندی فەڵەستینیی تۆژینەوەی ناتوندوتیژی لە کانوونی دووەمی ١٩٨٥، بە دەستی گرووپێکی فەڵەستینییەکانی بەشی عەرەبی قودس کە ئیسرائیل داگیری کردووە، دامەزرا. ئەم ناوەندە کە هەموو ئەو تاک و گرووپانە وەردەگرێت کە حەز لە ناتوندوتیژی دەکەن، هزر و کردەوەکانی گاندی و مارتین لۆتەر کینگ وەک نموونە وەردەگرێت و پرۆگرامی لێکۆڵینەوە و فێرکردنی تیۆری و پراکتیکیی ناتوندوتیژی دەخاتە بەر دەستی ژمارەیەکی زۆری فەڵەستینییەکان و جیهانی عەرەب بە شێوەیەکی گشتی. ئەم ناوەندە لەم بەشانەی خوارەوە پێکهاتووە: ناوەندی لێکۆڵینەوە، کتێبخانە، پروپاگەندەو ڕاگەیاندن و تد... جگە لەوەش کۆمەڵێک چالاکی جۆراوجۆر ئەنجام دەدات. کۆکردنەوەی سەرمایە، دابینکردنی گوژمەی خوێندنی منداڵان، خۆپیشاندان لە دژی ڕەفتاری توندوتیژانە بەرامبەر بە زیندانییەکان و پارێزگاریکردن لە خێزانەکان.

### گرووپی کاری ڕاستەوخۆی ناتوندوتیژی

گرووپی کاری ڕاستەوخۆی ناتوندوتیژی (N.V.D.A.G.) لە ساڵی ١٩٧٨ لە سریلانکا دامەزرا. ئەم ڕێکخراوە لە شێوازەکانی خەباتکردنیدا

و هەروەها لە رووی رەنگرێژ کردنی ئەو کۆمەڵگایەی کە مەبەستیەتی، پەیڕەوی لە گاندی دەکات. ئامانجە سەرەکییەکانی ئەم گروپە بریتین لە: هاندانی خەڵک بۆ شێوازەکانی خەباتی خۆپارێزانە لە توندوتیژی، سەربەخۆیی زمان و خاکی تامیلەکان (Tamouls)، رەتکردنەوەی نەژادپەرستی و کەمکردنی گیانی چینایەتی. بەم شێوەیە، گرووپی ناوبراو بۆ کردنەوەی هەموو پەرستگا، و ئاریشگاکان بە رووی چینی خوارەوەی کۆمەڵگادا، و نەهێشتنی قەدەغەیی ئەوان لە چوونە ناو هەندێک لە دامەزراوەکان خەباتی کردووە کە زۆربەی هەوڵەکانی سەرکەوتوو بوونە. شێلڤانا یاگام (Chelvana Yagam) دامەزرێنەری ئەم رێکخراوە خۆبەدوورگرە لە توندوتیژیە، کە بە گاندیی سریلانکا ناونراوە، پارێزەرێکی میتۆدیستە (رێبازێکی پرۆتستانتی یە. وەرگێڕ).

### سرڤیسی ئاشتی و دادپەروەری

سرڤیسی ئاشتی و دادپەروەری (SERPAJ) مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە. لە نێوان سالانی ١٩٦٩ تاکو ١٩٧٣، لە نێو گرووپە مەسیحییەکاندا، سرڤیسێک بۆ کاری ئازادیخوازانەی خۆپەنادان لە توندوتیژی دروست بوو. لە ١٩٧١ تاکو ١٩٨٠، ئەو هاوکارییە پتەو بوو و خەباتی ئەوان بە مەبەستی رێزگرتن لە مافی مرۆڤ و لە دژی زەبروزەنگی رۆژانە چڕبووەوە. هەر لەو کاتەدا بوو کە دامەزرێنەرەکەی، پیریز ئیسکویڤێل خەلاتی نۆبلی وەرگرت و رەهەندی جیهانیی بەم بزاڤە بەخشی. بە ناوبانگترین کارەکانی ئەم سرڤیسە بریتین لە: ئەو هەنگاوەی کە رزگاربوونی ئورۆگوا لە دیکتاتوریەتی عەسکەریی لێکەوتەوە. مانگرتن لە خواردن لە ئابی ١٩٨٣، خۆپێشاندانەکانی تشرینی دووەمی ١٩٨٣ و مانگرتنی گشتیی کانوونی دووەمی ١٩٨٠ . سرڤیسی ئاشتی و دادپەروەری بەناو ئەرجەنتین، بەرازیل، چیللی، ئۆکوادۆر، نیکاراگوا،



پەنەما، ئورۆگوای و پیرۆدا بلاوبوونەتەوە، ئیلهام لە پەیامی ئینجیل و نموونەکانی گاندی و مارتین لۆتەر کینگ وەردەگرێت. ئەم رێکخراوە لەرێی خۆپاراستن لە توندوتیژی دەیەوێ ئاشتی و دیموکراسی لە ئەمریکای لاتینیدا پیادە بکات.

### بزاڤی ناتوندوتیژی لوبنان

بزاڤی ناتوندوتیژی لوبنان، لە سالّی ١٩٨٦، بە جیابوونەوە لە کۆمیتەی رێپێوانی شەشی مارسی ١٩٨٤ دروست بوو. ئەم بزاڤە پەیوەندیی لەگەڵ رێکخراوە مرۆڤ دۆستەکانی تردا خەبات بۆ ئاشتی و مافی مرۆڤ دەکات. دامەزرێنەرە سەرەکییەکەی خاتوو «لورە مۆقیزەل» (Laure Moghizel)ە کە کاری پارێزەری دەکات.

### کۆمەڵەکانی ئەرش

کۆمەڵە لادێیەکانی ئەرش، بە دەستی لانزادێل ڤاستۆ (Lanza del Vasto)، قوتابی گاندی و ڤینۆبا دامەزرا و هەڵساوە بە کۆکردنەوەی ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە هەوڵدەدەن بەپێی رێنماییەکانی گاندی لە رێگەی ناتوندوتیژییەوە بژین. ئەوانە مولزەمن بەم ئامانجەوە لەفەرەنسا، نۆ کۆمەڵەیان پێکهێناوە کەپەیڕەوی لە بۆچوونەکانی گاندی دەکەن و لە ئیسپانیا دوو ولە ئیتالیاش دوو ولە کیپک کۆمەڵێکیان درووستکرد. نوێنەری تریان لە ئەرجەنتین هەیە. ئەندامەکانی ئەو کۆمەلانەی کە پەیڕەوی گاندین هەوڵدەدەن بە گەڕان بە دوای راستیدا لە رێگەی رێزگرتن لە ئەوانی تر یارمەتی هەموو ئەوانە بدەن کە وێڵی راستین.

### بنکەی ئاشتیی گاندی

بنکەی ئاشتی گاندی لە سالّی ١٩٥٦، بە دەستی کەسانی وەک

جەواهیر لال نەهرۆ و ج.پ. نارایان (J. P. Narayan) دامەزرا. ئەم بنکەیە تێکهەڵکێشکردنی ڕێکخراوێکە لە فەرمانەکانی گاندی، ڕاستی، دادپەروەری و ناتوندوتیژی، و ڕاستییەکانی سەدەی بیستەم (ڕێگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی چەکی ناوەکی، کۆتایی هێنان بە جەنگە نەتەوەییەکان، خەبات لە دژی هەژاریی کۆمەڵایەتی- ئابووری)

ئامانجی ئەم ڕێکخراوەیە لێکۆڵینەوە و جێبەجێکردنی ڕێنماییەکانی ماهاتما گاندییە لەڕێی جەخت کردن لەسەر نوێیەتییان بۆ جیهانی ئێمە. بۆیە، لە سێ بواری سیخوڕی، ڕاگەیاندن، کاری ڕاستەوخۆ بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی بۆچوونەکان گاندی لە بواری ناتوندوتیژییدا چالاکی دەنوێنێت. ئەم بنکەیە بڵاوکراوەی Gandi Marg بە زمانی ئینگلیزی و هیندی بڵاودەکاتەوە. ئەندامە چالاکەکانی بنکەی ئاشتیی گاندی کەم تا زۆر لە هەموو شوێنەکانی هیندستاندا دەژین و بە بەخشینی یارمەتییەکانی خوێندن، تەندروستی و تەکنەلۆجی ڕاستەوخۆ یارمەتی لادێییەکان دەدەن. ڕاڤیندرا ڤارما (Ravindra Varma) بەڕێوەبەری ئێستای ئەم بنکەیەیە.







«یەکێک لە گرنگترین کێشەکانی مێژوو ئەوەیە کە هەمیشە دوو چەمکی خۆشەویستی و دەسەڵات وەکو دوو جەمسەری رکابەر دەکەونە دژایەتی یەکترەوە»

**مارتین لۆتەر کینگ**

خەڵکانێکی زۆر لەو بڕوایەدان کە توندوتیژی تاکە ڕێگەی گۆڕانی کۆمەڵگای مرۆییە و ئەگەر گوتەزایەکیش بە ناوی ناتوندوتیژییەوە هەبێت، ئەوا ریزپەڕی مێژووییە کە تەنیا تایبەتە بە پێغەمبەر، سۆفی و کەسایەتییە بەرچاوەکانی مێژوو. بەڵێ، بێگومان ناتوندوتیژیی شتێکی ریزپەڕە و ئەو کەسانەی دایانمەزرادووە و هزرڤانانی چەمکی ناتوندوتیژی بوونە، وەک مرۆڤە ریزپەڕەکان حسابیان بۆ دەکرێت، بەڵام لەوانەیە ریزپەڕبوونی هەر یەکێک لەوانە لەبەر ئازایی و دلێریان بێت لە بیرکردنەوە و روونکردنەوەی چەمکێک کە ئەوانی دیکە ناوێرن بیری لێبکەنەوە. لەبەر ئەوەش ناتوندوتیژی هزرێکی ریزپەڕە، چونکە بە پێچەوانەی پرۆسەی ئێستای مێژووی مرۆڤایەتی هەنگاو دەنێت. بەڵام ئەم بەپێچەوانەوە بوونەی پرۆسەی ناتوندوتیژی بەڵگەیەک نییە لەسەر نائێستایی بوونی. ناتوندوتیژی هەنوکەییە چونکە هاوکات بە رابردوو، ئێستاو داهاتووی مرۆڤایەتی پەیوەست دەبێت. گاندی هەمیشە دەیگوت ناتوندوتیژی بە قەد کۆنیی چیاکان کۆنە. لەوەتەی مرۆڤ هەیە ناتوندوتیژیش هەبووە، چونکە لە هەر شوێنێک توندوتیژی رووی دابێت، کەسێکیش لە بەرامبەر ئەو توندوتیژییەدا ناڕەزایی دەربڕیوە. ئەم دژایەتیکردنەی زەبروزەنگ لە



ڕێگەی گوتەوە، خۆی یەکەمین قۆناغی ناتوندوتیژییە. ئەو کاتەی کە تاکێک یاخود چەند تاکێک لە نادادپەروەری و ملکەچی بێزار دەبن، و ناڕەزایی دەربڕین و ماندەگرن و پەناگیری و سەرپێچیی مەدەنی دەکەن، لە چوارچێوەی ناتوندوتیژیدا کاریان کردووە. بۆ نموونە کاتێک گرووپێک بۆ بەرگریکردن لە ژینگە یاخود کوشتنی نەهەنگەکان یان تاقیکردنەوە ئەتۆمییەکان دێتە ناو کۆمەڵگاوە، کاری خۆبەدوورگرتن لە توندوتیژیی ئەنجام داوە. و لەو شوێنەی کە کەسێکی وەکو دایکە تێریزا رووبەڕووی هەژاری و بەدبەختیی نەداران لە جیهاندا دەبێتەوە، دیسان ئەو جەنگە بە مەبەستی داکۆکیکردن و چەسپاندنی ناتوندوتیژی ئەنجام دراوە. ئەو شتەی کە ناتوندوتیژی فێرمان دەکات، قابیلیەتی ئیسلاح بوونی مرۆڤەکان و کۆمەڵگای مرۆییە. بە دەستەواژەیەکی تر، بۆ تێپەڕین لە رەوشێکی کۆمەڵایەتییەوە بۆ رەوشێکی تر پێویست ناکات نەتەوە و توێژە کۆمەڵایەتییەکان لە ناوببەین و تاروماریان کەین.

هەر بۆیە چاکسازیی کۆمەڵایەتی بە پێچەوانەی شۆڕش عاقڵانەترین و لێبووردەترین جۆری ناتوندوتیژییە. لەبەر دوو هۆ: یەکەم ئەوەیە کە، ئەو چاکسازیخوازە کۆمەڵایەتییانەی کە بڕوایان بە زبروزەنگ نییە، گەوهەری گیروگرفت و خراپییەکان نەک بۆ تاکەکانی کۆمەڵگا، بەڵکو بۆ دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان و شێوازی کارەکانیان دەگێڕنەوە و هەوڵدەدەن دامەزراوەی مرۆڤانەتر و دادپەروەرانەتر بکەنە ئەلتەرناتیڤیان. دووەم، چاکسازیخوازی شێوازێکە بۆ رێزگرتن لە یاسا، و بناغە و بنچینەی دیموکراسیی یاسا و رێزگرتن لە یاسا. کەواتە چاکسازیی کۆمەڵایەتی گۆڕانی یاساکانە بەناوی بەرگریکردن لە یاسا نەک هەوڵدانێک بێت بە پێچەوانەی ئەوەوە. مارتین لۆتەر کینگ بە پشت بەستن بە یاسا دیموکراسییەکانی ئەمریکا داوای بەدەست هێنانی ئازادییە مەدەنییەکانی بۆ رەشپێستە ئەمریکیەکان دەکردو دالایی- لاما یاسا نێونەتەوەییەکان و فەلسەفەی ناتوندوتیژی، کرد بە

پایه و بنچینەی دژایەتیی خۆی لەگەڵ چینی داگیرکەر.

کەواتە ڕیفۆرمیزم خۆی دەتوانێت شێوازێکی خۆبەدوورگیرانە بێت لە توندوتیژی بۆ هێور کردنەوەی کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان. هەروەها چاکسازیخوازی هەوڵێکە بۆ بەدیهێنانی دیموکراسی یاخود نەهێشتنی گیروگرفتەکانی. گوتنی ئەوەی کە دیموکراسییە رۆژئاواییەکان خۆیان بەرهەمی شۆڕش و گۆڕانکارییە توندوتیژەکانن، بەڵگەیەکی پێویست و کافی نییە بۆ پەنابردنەبەر توندوتیژی بۆ نەهێشتنی کێشە دیموکراسییەکان. چونکە توندوتیژی چارەسەری دیموکراسی ناکات، بەڵکو لە ناوی دەبات، هەروەها ئەگەر ئامانج، بەرپاکردنی دیموکراسییە بە مانای حکومەتی یاسا و لێبووردەیی، ئەوا ئەو ڕێگایەی کە دەبێت بۆ گەیشتن پێی بیگرینەبەر، پێویستە خۆیشی لێبووردەیانە و یاساپەروەر بێت، بۆیە هەمیشە جەوهەری ئامانج لە هۆ دایە. وەک گاندی دەڵێ: پێویستە هەمیشە هۆ و ئامانج لە یەک جەوهەر بن. چونکە بە چاندنی تۆوی رق و کینە ناتوانین بەرهەمێکی بێ توندوتیژی وەدەست بێنین. لەوانەیە لاوازی زۆربەی ئایدیۆلۆجییە سیاسییەکان لەو نایەکسانیەدا بێت کە لە نێوان دوو چەمکی هۆ و ئامانجدا دروستی دەکەن. زۆربەی ئەم ئایدیۆلۆجییانە خۆیان بەلایەنگری یەکسانی، ئازادی و دیموکراسی دەزانن. بەڵام لەگەڵ یەکەمین هەنگاویان بەرەو توندوتیژی لە ئامانجە بەرزەکەیان دوور دەکەونەوە. کەواتە ئەوەی گرنگە تەنیا گەیشتن نییە بە ئازادی، بەڵکو شێوەی گەیشتنە پێی. دژایەتی مارتین لۆتەر کینگ لەگەڵ سیاسەتە توندوتیژەکانی مالکۆم ئیکس و پانترە رەشەکان بۆ بەرگریکردن لە مافەکانی رەشە ئەمریکیەکان، بە مەبەستی یەکسانی لەگەڵ سپیپێستەکان و ڕێزگرتن بوو لە مافە مەدەنییەکان لە ئەمریکا. لۆتەر کینگ لە وەڵامی مالکۆم ئیکسدا کە دەڵێت: «لەگەڵ ئەوانەی کە دوژمنانە لەگەڵتان دەجەنگن، دوژمنانە بجەنگن»، دەنووسێت: «وەڵامدانەوەی رق و کینە بە رق و کینە سوودێکی



نییە، مەگەر برەودان بە خراپە لە جیهاندا.»

کەواتە ستراتیجییەتی ناتوندوتیژی، خەباتکردنە بۆ دادپەروەری و ئاشتیی مەدەنی و ناساندنی بەهای یاسا بە هاووڵاتییان. بەم شێوەیە ناتوندوتیژی وەک تێزێکی پەروەردەیی بۆ بەرپرسیاریەتی خستنە ئەستۆی هاووڵاتییان دەردەکەوێت. گاندی دەیگوت: «یەکەمین زەروورەتی ناتوندوتیژی، رەچاوکردنی دادپەروەرییە لە دەوروبەری خۆت و لە هەموو بوارەکاندا». بێگومان داهاتووی ناتوندوتیژی لەم پەیامەی گاندیدا شاراوەیە.

